حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە
زنجیرە ( ٣١٧ )

# کێشە نەتەوەییەکانو ڕووداوە سیاسیەکانی کوردستانو جیهان

## لێکۆڵینەوەیەکی سیاسییە

د. کەمال مەعروف

سلێمانی - ٢٠٠٥

# کێشە نەتەوەییەکانو ڕووداوە سیاسیەکانی کوردستانو جیهان

نووسینی:د. کەمال مەعروف

بابەت: لێکۆڵینەوەی سیاسی

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

بەرگ : دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی تیشك

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (١٢٧)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnbiri . org

# پێشەکی

دوا بەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی ساردو نەمانی یەکێتی سۆڤیەت کەڕووداوێکی سیاسی مەزن بوو، بەنەمانی جەمسەری ناکۆك لەنێوان ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەوروپادا، سیستەمێکی نوێی جیهانی هاتە ئاراوە، ئەم سیستەمە نوێیەش کەخۆی لەدیموکراسیەت و فرە حیزبی و بازاڕی ئازاد دەنواند، ئیمڕۆ ئەمریکا تاکە زلهێزە لەڕووی سیاسی و ئابووری و سەربازییەوە لەسەرانسەری جیهاندا، کەتوانی عێراق لەدەست دیکتاتۆری خوێن ڕێژ ڕزگار بکاو ئەزمونێکی نوێی مێژووی لەبەردەم گەلانی عێراق والا بکاو خەون و ئاواتەکانیان بەرەو ڕۆناکی بەرێ، بەتایبەتی بەشداری کردنی گەلی کورد لەگەڵ هاوپەیمانەکان بەتەفروتونا کردنی مۆڵگاکانی تێرۆریست لەکوردستانداو لەڕزگارکردنی کەرکوك و مووسڵیش دا لەپێشەوە هێرشەکە دابوون، بەمەش توانی شوێنی شیاوی خۆی لەکێشە جیهانیەکاندا دیاری بکات. بەهۆی ئەم گۆڕانکاریانەوە کەلەناوچەکەدا ڕوویدا، گەلی کورد توانی هەندێ لەداخوازییەکانی لەدەستووری کاتی‌دا بەرجەستە بکات و لەدەستوری هەمیشەیش دا سەرجەم خەونەکانی بهێنێتە دی بەدیاری کردنی تەواوی سنووری کوردستانی باشوور، بەکەرکووك و خانەقین و شارو شارۆچکەکانی تر کەدووچاری ڕاگواستن و وێرانکاری ببوونەوە. لەکاتێکدا کەئەوروپا بەرەو تەواوکردنی یەکێتی ئەوروپی هەنگاو دەنێ، بەشێوەیەکی واقیعی و دیموکراسیانە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی‌یە هەرێمەکان

لەناو دەوڵەتی نەتەوەیی گەورە دەدا، بەگواستنەوەی هەندێ دەسەڵاتی ناوەندی بۆ هەرێم و ناوچەکان و فراوان کردنی چەمکی ئۆتۆنۆمی کە لەگەڵ ئاوات و تایبەتمەندیەکانیان بگونجێ کە لەیاسای دەستووری ئەوروپیدا جێگیر کراوە. تاکو بەرەنگاری شەپۆلە جوداخوازە توندڕەوەکانی، هەندێ بزوتنەوەی نەتەوەیی ناوچەیی بێتەوە، بەتایبەتی هەندێ لەولاتە ئەوروپیە پێشکەوتووەکان دا دەیانەوێ بەڕێگای دیموکراسی و دبلۆماسی چارەسەری کێشەکان بکەن، وەك باسك و کەتەلۆنیا لەئیسپانیادا لۆمباریا و سردینیا و سەقەلیەو ناوچەکانی ئەلەب لەئیتاڵیادا، ئیسکوتلنداو یلزو ئێرلەندا لەبەریتانیادا، هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتی (براند سبورگ) لەئەڵمانیادا. کەچی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی‌یەکان بەلای هەندێ دەوڵەتەوە چ ئەوروپی پێشکەوتوو بێ یاخود ولاتە تازە گەشەسەندووەکانەوە بێ بەلاوازی دەوڵەتی گەورەی دادەنێن و بەڕێگای چەك و تۆقاندن وەلامیان دەدەنەوە، بۆ نموونە کێشەی چیچانەکان، مەکدۆنیەکان. لەولاتە تازە گەشەسەندوەکانیش وەك خوارووی سوودان، کێشەی کشمیر، کێشەی کەبیلەکان (بەربەرەکان)، کێشەی بیابانی ڕۆژئاوا، کێشەی کوردەکان لەتورکیا و ئێران و سوریادا).

لەدووتوێی ئەم کتێبەدا جگە لەکارەساتەکانی گەلی کورد، لەتوێژینەوەکەمدا باسی هەرەس هێنانی یەکێتی سۆشیالتی سۆڤیەت، کێشەی چیچانەکان، کێشەی مەکدۆنیەکان، کێشەی بەربەرەکان، کێشەی بیابانی ڕۆژئاوا، کیشەی ولاتی باسك کراوە، هەروەها ئاماژە بەدوو سەرکردەی مێژوویی سۆشیال دیموکراتەکان، مسیۆ میتران و ئۆلف پالمە کراون کەڕۆڵی گرنگیان گێڕاوە لەچارەسەرکردنی کێشەکانی جیهانی سێیەمدا مسیۆ میتران بەئەزموون و بازدانێکی

گەورەی فەڕەنسا دادەنرێ کەتوانی هەموو هێزە چەپەکان بە ڕادیکا و شیوعی یەکان لەدەوری حیزبی سۆشیال دیموکرات کۆبکاتەوە، وەبۆ یەکەم جار مسیۆ میتران سەرۆکی دەوڵەتی فەڕەنسا لەشەوی ١٩٩١/٣/٣ دا لەتەلەفزیۆن ڕایگەیاند کەفەڕەنسا پاش نەمانی شەڕی کەنداو هەوڵ دەدات بۆ ئاشتی و چارەسەرکردنی گیروگرفتی، فەلەستین، لوبنان و کورد، هەروەها مرۆڤ نابێ ئەو هەموو خەمخۆری و کۆشش و هەڵوێستە جوامێرانەی دانیال میتران کەخێزانی سەرۆک میترانە لەیاد بکات کەبووە هۆی سازکردنی کۆنفرانسێکی نێو نەتەوەیی لە ١٤-١٥/١٠/١٩٨٩دا بەناوی ماڤ مرۆڤایەتی و کەسایەتی کەلتووری کورد. ئۆلف پالمەش وەك سەرکردەیەکی سۆشیال دیموکرات دژی چەوساندنەوەی ڕەش پێستەکانی باشووری ئەفەریقا و دژی دەست تێوەردانەکانی ئەمریکا بوو لەڤێتنام و خۆرهەلاتی ناوەڕاست دا، سیاسەتمەدارێکی بەتوانا و سەرسەخت و خاوەن هەڵوێست بوو دژی تیرۆرو تۆقاندن وەستا، پشتگیری دۆزی گەلی کورد و فەلەستینەکان بوو، لەپرسیارێکدا کە مەحموود باکی ڕۆژنامەنووس و نووسەری کوردستانی باکوور ئاراستەی ئولف پالمەی کردبوو، سەبارەت بەچۆنیەتی سەیر کردنی سۆشیال دیموکرات بۆ دۆخی کوردەکان، ئولف پالمە لەوەلامدا دەڵێت: ئێمە پێمان وایە کەکوردەکان شەرعیەتێکی نەتەوەییان هەیە، کەئەومانایە دەبەخشێت کەجێی خۆیەتی ماڤ خۆبەڕێوە بردن وەربگرن ئەم خۆ بەڕێوەبردنە جێی خۆیەتی بەگفتوگۆ وەدەست بهێنرێت واتە بەڕێگای ئاشتی.

لەکۆتاییدا دەمەوێ ئەوە بڵێم کە لەتەك خوێندنی دکتۆراکەم کە لەسەر شیعری نوێیە، ساڵی ١٩٨٧ لەگەڵ پرۆفیسۆری مێژوو

محەمەد شێخ موس گوزێل (Mehmet sehmus Guzel)
لەزانکۆی پاریسی حەوتدا، ماجستێرەکەم لەسەر ناسینی جیهانی سێیەم
(Le Diplome detudes Approndies de Connaissance des Tiers Mondes ) خوێند
هیوادارم بەم کورتە لێکۆلینەوەیە توانیبێتم خزمەتێکی بچووکی مێژووی گەلەکەم کردبێ.

# کارەساتی هەڵەبجە لەدیدی ئەوروپییەکانەوە

کارەساتی هەڵەبجە هەموو جیهانی هەژاند، بەڵام حکومەتەکانی ئەورووپای نەوروژاندو بە ڕەسمی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە عێراق سەرزەنشت نەکرا!! ئەمەش بەهۆی هەڵوێستی چەند وڵاتێکەوە بوو، کەدژی ئەوە ڕاوەستان عێراق تاوانبار بکرێ، بەبیانوی پاراستنی تەرازووی هێزەکانو بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیانەوە، ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا لەبڕیاری (٢٧٦٣- S) دا دەربارەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆسایدی ساڵی ١٩٨٨ ڕەفتاری ڕژێمی عێراق لە کوردستاندا بەجینۆساید پێناسە دەکات.[(١)]

بەفەرمانی سەرۆکی کاروباری دەرەوە لەکۆنگرێسی ئەمریکی دوو نوێنەری پەرلەمانی هاتنە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لەوەزعی کورد هەردوو نوێنەرەکە (پیتەر کالبرایث و کریستوڤەر/ ڤان هولین) بوون لە ڕاپۆرتێکی تایبەتییدا کە لە١٢ی ئەیلولی ١٩٨٨دا داویانە بە کۆنگرێسی ئەمریکی، سیاسەتی عێراق بەکوشتنو بەکارهێنانی گازو ڕاگواستن تاوانبار دەکەن دیارە مەبەستی فەوتاندنی کەلتورو تایبەتمەندی جۆری ژیانی کوردە، ئەگەر ئەمەش جینۆساید نەبێ، بەڕاستی هەروەکو لە پەیماننامەکەدا پێناسەکراوە، ئەوا ڕەفتاری عێراق بێگومان خەسڵەتی زۆری هەیە کە بە تەواوی لەگەڵ ئەم تاوانەدا دەگونجێ..[(٢)].

لە ٧ی سێپتەمبەر کاری ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی بەردەوام بوو، لە خولی ناوەندی کەشی هاوین لەرۆژی دوایی بڕیاری ژمارە (٢٧٦٣) دژی لەناوبردنی گەلی کورد پێشکەش کراو داواکرا کە سزای عێراق بدرێت، لە٩ی سێپتەمبەر ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی بە زۆرینەی دەنگ بڕیاریان لەسەردا، بەم جۆرە تاوانبارکردنی عێراق لەنێوان کۆنگرەو ئەنجومەنەوە هاتووچۆی پێکرا، بەداخەوە لەدواییدا کاری پێنەکراو بڕیاری رەسمی پێ دەرنەچوو، بەڵام دوای ساڵێك بەگوێرەی بڕیاری ژمارە (٨٩٥) بڕیاردرا کەپەیوەندی ئابووری ببڕێ لەنێوان ئەمریکاو هەر دەوڵەتێك کەچەکی کیمیاوی‌و بایۆلۆجی بەکار بهێنێ کەدژی شەرعیەتی دەولییە، ئەم بڕیارە لەلایەن لیژنەی کاروباری دەرەوە لەئەنجومەنی پیران بڕیاری لەسەر دراو بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەك بۆ عێراق ناردرا ئەوەی پەیوەندی بەفەرەنساوە بێت، میسۆمیتران ڕاڕایی‌و نیگەرانی خۆی بەرامبەر بەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دەربڕی، بەڵام بەشێوەیەکی ڕەسمی عێراق سەرزەنشت نەکرا، بۆ ئەم مەبەستەش دەوڵەتی فەڕەنسا لە ١٧/١١/١٩٩٠دا کۆنفراسێکی نێو نەتەوەیی رێك خست بەسەرۆکایەتی مسیۆمیتران بۆ قەدەغەکردنی چەکی کیمیاوی، بەڵام ئەوەی لەهەموو شت سەیرتر بوو بەهیچ شێوەیەك رژێمی فاشی عێراق یان تاوانبار نەکردوو بەتاکە ووشەیەك چی‌یە ڕاستەوخۆ باسی هەڵەبجەیان نەکردو ڕێگاشیان نەدا کەکورد نوێنەرێکی لەکۆنفرانسەکەدا هەبێت.

دەوڵەتی بەریتانیاو ئەڵمانیای فیدرالیش ناڕەحەتی و نیگەرانی خۆیان دەربڕی و داوایان لە عێراق کرد کەواز لەم کارانە بهێنێ‌و ڕێگای ئاشتیانە بگرێتەبەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد،

یەکێتی سۆڤیەتی جارانیش یەکێك بوو لەو دەوڵەتانەی دژی ئەوە راوەستا کەعێراق سەرزەنشت بکری، لەرۆژنامەی پراڤداشدا تەنیا کورتە هەواڵێك لەسەر قڕکردنی بەکۆمەڵی خەڵکی بێگوناهی هەڵەبجەو ناوچەکانی دیکەی عێراق نووسرابوو (ئەلکسندەر زۆتۆف) کە لێپرسراوێکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو دەڵێ:- (( بۆ ئێمە شەرمە لەکاتێکدا کەهەموو جیهان پشتیوانی لەکوردەکان دەکەن، هاوبەشی خەمیانن کەچی واپێشان دەدەین کەگوایە هیچ ڕووی نەداوە[٣].

بۆ وڵاتانی تر وەکو سوید، دانیمارك، فینلەندا، هۆڵەنداو نەرویجو چەند وڵاتێکی کە، داوایان لە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد کە لەمەسەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بکۆڵنەوە. بۆ ئەم مەبەستەش وەفدی خۆیان ناردە کوردستان بۆ ساغ کردنەوەی ئەوەی کە ئایا چەکی کیمیاوی بەکارهاتووە یاخود نەء؟ چونکە حکومەتی عێراق بەهەموو شێوەیەك نەفی کردو حەملەیەکی دبلۆماسیشی کرد بۆ ئەوەی دەوڵەتە عەرەبیەکان پاڵپشتی بکەن لەراستیشدا بەشێك لەوڵاتە عەرەبیەکان پشتیان گرت. (غوین روبرتیس) رۆژنامەنووس و دەرهێنەری تەلەفزیۆنی بەریتانی، کۆمەڵێ فیلمو بەڵگەنامەی لەبارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەلایەن عێراقەوە دەرهێناوەو لەکەناڵی چواری تەلەفزیۆنی بەریتانی پێشکەشی کردووە. لەم ڕووەوە غوین دەڵێ:- مانگی نۆڤەمبەر ساڵی ١٩٨٨ هاتمە کوردستان ئامانجی سەرەکیم دۆزینەوەی بەڵگەنامەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژی دانیشتوانی مەدەنیو چەکدارەکان بوو، لەڕاستیدا کۆمەڵێ بەڵگەی بن بڕم چنگ کەوت لەگەڵ خۆمدا هێنامو ڕەوانەی موختەبەراتی سەر بە وەزارەتی بەرگری بەریتانیام کرد لە ئەنجامدا دەرکەوت کەغازی

خـەردەل بـەکاربراوە، (پیتـەر کالبریـث) کـە فەرمانبـەرێکی لیژنـەی پەیوەندییـەکانی دەرەوەیـە لـە ئەنجومـەنی پیرانـی ئـەمریکا دەڵـێ: بـەکارهێنانی چـەکی کیمیـاوی لەلایـەن عێراقـەوە ویـژدانی جیهـانی بزوانـد بەتایبـەتی وێنـەکانی هەڵەبجەو کۆچڕەوەکە، لیژنـەی نـاوبراو داوای لەمن کرد کـە لـەم کارە بکۆڵمـەوە پـاش ئـەوەی کۆمـەڵێ بەڵـگەم خستە ڕوو کە چەکی کیمیاوی بـەکارهێنراوە بۆ تێکدانی گوندەکانی کوردسـتان و کـۆچ پێکردنـی خەڵکەکـەی لەلایـەك، لەلایـەکی دیکـەوە سڕینەوەی شوناسنامەی نەتـەوەی کـورد. (کلیبـورن بیـل) سیناتۆری ئـەمریکی سـەرۆکی لیژنـەی کاروبـاری دەرەوە لـە ئەنجومـەنی پیرانـی ئـەمریکا لـەکۆنگرەی پـاریس سـاڵی ١٩٨٩دا ووتـی:- مـن دڵنیـابووم لەڕاسـتی دەنـگ و باسـی بـەکارهێنانی چـەکی کیمیـاوی کـە ڕۆژئاواییـەکان سـەردانی کوردسـتانیان کردبـوو لـە ڕاپۆرتەکانیانـدا ئاماژەیـان بـەوە کردبـوو کەبەسـەدان گونـد کـاوڵ کـراون و چـەکی کیمیـاوی بـەکاربراوە، ڕژێمـی عێـراق سیاسـەتی گەیشـتوتە پلەیـەك دوورە لەهـەموو کـارێکی مرۆڤانـە، (اوبـان هینـدریکس) پرۆفیسـۆری بـەلجیکی و پسـپۆری کەرەسـتەی ژەهراوییـە لـەم ڕووەوە دەڵـێ:- لـە ڕێگای ئێرانەوە گەیشتمە هەڵەبجە کاتێ گەیشتمە هەڵەبجە هـەموویان نەمردبوون، پاشـان دەسـتمان کـرد بـەژماردنیان ٣,٥٠٠ کوژراو هـەبوو بەلایـەنی کەمـەوە سـێ جۆر گـازی بەکارهێناوە، وەکـو سیـانید، گـازی دەمـاری کـە ئەڵمانـەکان پـەرەیان پێـداو لەشـەڕی جیهـانی دووەمـدا لەسـەر گرتووەکانـدا تاقییـان کـردەوە، هـەروەها گـازی ئیسـپریت کـە ئەڵمانـەکان لەشـەڕی جیهـانی یەکەمـدا دژی لەشـکری فەرەنسـی و بەلجیکیـدا بـەکاریان هێنـا، هەنـدێ لەنەخۆشـەکانمان لەخەسـتەخانەی بـەلجیکی چارەسـەرکرد هـەموو ئـەو ڕاپۆرتانـەمان گەیانـدە نەتـەوە

یەکگرتووەکان و سکرتێری گشتی بەڕێز (دیکویلار) لەجنیف، جەخت لەسەر ئەوە دەکەم کە عێراق سەرزەنشت نەکرا بەرامبەر بەو تاوانەی کەلەدژی کوردەکانی هەڵەبجە ئەنجامیدا[٤].

(سێڤان یەرتین) لەبەڕێوەبەرایەتی دەرەوەی بیرۆی تیلەگرامی رۆژنامەکانی سوێد کاردەکات لەبارەی گەشتەکەیدا بۆ کوردستانی عێراق دەڵێ:- سەرم لەگوندو شاری تری دیکەی کوردنشین دابوو. بەڵام قەت سەرم بەژووری ماڵاندا نەکردبوو، ئەمجارەیان وام کرد هەموانم بەمردوویێتی لەژووری ماڵەکاندا بینی، مردنێکی بێ ئاژاوە، بێ شپرزەیی، بێ شڵەژان هەروەها بەردەوام دەبێ و دەڵێ لەتاران چاوم بەسێ دکتۆری بەلجیکی و هۆڵەندی کەوت کە لە ٢٠ی مارسدا سەردانی هەڵەبجەیان کردبوو، ئەوان پوختەیەکی ئەو دەرمانە کیمیاییانەو ئەو ژەهرانەیان بۆ ڕوون کردمەوە کەبەکارهێنرابوون، ئێستا بەتەواوی ئاشکرایەکە کەبەگازی سیانیدو سیناپ خەڵکی هەڵەبجە کوژران[٥] (یووان سڤانتەرسون) پسپۆرێکی سویدییە لەدەزگای تۆژینەوەی بەرگری کاردەکات دەڵێ: گومان لەبەکارهێنانی گازی سیانیدو سیناپ لە هەڵەبجەدا نییە بەڵام ئەو بۆ خۆی گومانی لەبەکارهێنانی ژەهری دەمار هەیەو دڵنیاشە لەوەی کە زەردەبارانی لەگەڵ نەبووە: تەنانەت تاریق عزیزیش کە ئەو کاتە وەزیری دەرەوەی عێراق بوو، لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریدا لەبۆن لە١ی تەمووزی ١٩٨٨دا وتی: هەردوولا، عێراق و ئێران چەکی کیمیاوییان بەکاربردووە، پاش ئەوەی جەخت لەسەر ئەوەکرا کەچەکی کیمیاوی بەکارهاتووە لەو راپۆرتەی لە١٩ی ئابی ١٩٨٨ خرایە بەردەستی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتان، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان نیگەرانی خۆی پێشاندا بەرامبەر بەو ئامانجەی کە

کۆمەڵی پسپۆرو شارەزا گەیشتبوونێ، ئەم سیاسەتە دوو فاقیەی حکومەتەکانی ئەوروپا، رۆژنامەنووس و لێکۆڵەرەوەکانی نارەحەت کرد، بۆیە وەك نارەزای بیروڕای خۆیان لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا خستەڕوو. (جاك میلانۆ) لەگۆڤاری نۆڤیل ئۆبسەرفاتوری فەرەنسیدا دەڵێ: لە ئاداری ١٩٨٨ چوومە هەڵەبجە باوەڕم وابوو کەخەونم بینیوە دانیشتوانی ئەم شارە مردنێکی کتوپڕیان بەسەردا هاتووە، هەندێ لەکاتی نان خواردندا، پیاڵەی چایان بەدەستەوەبوو، هەندێکی تر بەڕێگادا دەڕۆیشتن و ئافرەتێك منداڵە ساواکەی لەباوەشدا بوو، لەکاتێکدا سەتڵە ئاوی دەهێنا لەیەك کاتدا بارانی کوشندەیان بەسەرا دەباری وەکو بارانە تۆزاویەکەی (بۆمبای) نەبوو، بەڵکو بارانێکی بەرفراوان و زەرداوی کەبۆنی نووستنی ئەزەلی دەبەخشی، بارانی گازی خەردەل کەلەئاسمانەوە بەهۆی فرۆکەکانی عێراقەوە، سەددام حسێن بەسەردانیشتوانی هەڵەبجەی کوردیدا باراند، لەماوەی سێ چرکەدا بووە هۆی کوشتنی پێنج هەزار مرۆڤی کورد، لەگەڵ بریندارکردنی دە هەزاری دی بۆ ئەم تاوانە کە دژی مرۆڤایەتییە کەسێك لە ئێمە بەکردەوە شتێکی دەربارەی ئەم کارە ترسناکە نەکرد، مەگەر سەددام ئەوکاتە هاوڕێی ئێمە نەبوو. (مارتن ڤان برونسن) توێژەرەوە لە زمان و ئەنترۆپۆلۆجیای هۆڵەندا دەڵێ: لەناوەڕاستی مانگی مارسی ١٩٨٨دا فرۆکەکانی عێراق کیمیایان بەسەر شاری کوردی هەڵەبجە، لەنزیك سنوری ئێرانی هەڵکەوتوودا کرد، ژمارەی زیان و کوژراوەکانی هەڵەبجە بە پێی سەرچاوە جیاوازە، بەڵام ژمارەیەکی نزیك بە پێنج هەزار کەسی کوژراو بەگشتی بەژمارەیەکی ڕاست دانراوە، ئێران رۆژنامە نووسە بێگانەکانی بانگ کرد بێن و شاهێدی دیمەن و خوێن ڕێژی و کوشتو بڕین و هێندێك دیمەن و وێنەی

خەفەتاوی و ڕاچڵەکین بەجیهان نیشان بدەن، ئاشکرابوو کە زۆر لە قوربانیەکان خەڵکی لاشەڕو بێ چەك بوون، وێنەی ئەو دایك و باوکانەی کە منداڵە ساواکانیان بەباوەشەوە بوو بەمردووی لەسەر زەوی کەوتبوون[٦]. (ئەندریە زاخارۆف) ئەکادیمی رووس و خاوەنی خەلاّتی نۆبڵی ئاشتی دەڵێ: داوام وایە هەموو حکومەتەکانی جیهان ئەو مامەڵەی لەگەڵ کوردەکان ئەنجام دەدرێ لەبەرچاو بگرن کە چ جۆرە زوڵمی نەتەوەیی و کۆمەلاّیەتی و کوشتنی بەکۆمەڵی دەرحەق کراوە.

(دکتۆر کرستن م. گۆسدێن) دەربارەی هێرشەکەی سەر هەڵەبجە دەڵێ: ڕێگام بدەن دەست بکەم بە وەسف کردنی هێرشی گازی ژەهراوی بۆ سەرشاری هەڵەبجە لە عێراق دا. با جەخت بکەمە سەر ئەوەی کەئەمە گەورەترین هێرشی چەکی کیمیاوی بووە دژی دانیشتوانێکی مەدەنی لەچەرخی مۆدێرنیدا. هەڵەبجە شارێکی بەجموجۆڵ و چالاك بوو لەباکووری عێراق دا دانیشتوانی زۆرینەی کورد بووەو مەیلی ئێرانیان هەبووە، لەکاتی جەنگی عێراق – ئێراندا لەسالاّنی هەشتاکان ژمارەی دانیشتوانەکەی لەکاتی هێرشەکەدا نزیکەی ٨٠,٠٠٠ کەس بووە.

بەرپەچدانەوەی عێراق یەکان بریتی بوو لەتۆپ باران کردنی قورس و بۆم بارانکردنی ناوچەیەك نزیك هەڵەبجە بەچەکی تەقێنەری گەورەی شەش فرۆکەی جەنگی ڕێگە لەهاولاّتیان گیرا شارەکە بەجێ بهێڵن، بەو هیوایەی کە جەیشی عێراقی پەلاماری شارێك نادات کەهاولاّتیانی تیابێت، بەو هۆیە قەلغانێکی مرۆییان دابین کرد. هێرشی چەکی کیمیاوی کە لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ دەستی پێکرد، کاتێك گروپێك لەهەشت فرۆکەی جەنگی دەستیان کرد بە

بۆمباران كردنی كیمیاوی، بەگوێرەی ئەو كۆماندۆسە كوردانەی كەلە شوێنەكە بوون، لەماوەی شەوەكەدا ١٤/جار فرۆكەی جەنگی هێرشیان كردووەو هەر گروپەی پێكهاتووە لەحەوت بۆ هەشت فرۆكەی جەنگی و، تەركیزی هێرشەكانیان كردۆتە سەر شارەكەو هەموو ئەو ڕێگایانەی كەلە هەڵەبجەوە بەرەو دەرەوە دەچن. هێرشە كیمیاویەكە بەردەوام بوو هەتا ٣/١٩. فرۆكە جەنگییە عێراق یەكان نزیكەی (٤٥) خولەك هێرشیان دەكردو پاشان دوای ئەوەی دەرۆیشتن، دوای (١٥) خولەك گروپێكی دی لە فرۆكەی جەنگی دەردەكەتن، دەمەوێ جەخت بخەمە سەر ئەوە كەئەمە یەكەم هێرشی كیمیاوی نەبووە لەلایەن (سەدام حوسێن) ەوە پێشتر فرۆكەی جەنگی عێراقی هێرشی ئەنجامداوە دژی (٢٠) گوندی بچووك لەساڵی ١٩٨٧، بەهەرحاڵ پێوەرو چروپڕی شاڵاوی كیمیاوی دژی هەڵەبجە بەتەواوەتی جیاوازتر بوو.

یەكەم جاربوو كە چەكی كیمیاوی بەكارهاتبێ دژی دانیشتوانێكی مەدەنی گەورەی قەبارەوا. بەر كەوتوانی پەلامارەكە بریتی بوون لەئافرەت، منداڵ، پەككەوتە[٧].

# (كۆكتێلی )كیمیاوی سەدام حوسێن

شـتێكی دی هەیـه كەهەڵەبجـه جـودا دەكاتـەوە لەهێرشـه ناسراوەكانی دیكەی چەكی كیمیاوی كەهێرشەكە (ئۆوم شینریكیۆ) بـۆ سـەرجادەی نەفـەقی تۆكیـۆش دەگرێتـەوە لەسـاڵی ١٩٩٥، هێرشـەكەی هەڵەبجـه بـریتی بـوو لـەماددەی عـاملی زۆری كیمیـاوی، پێكهاتبوو لـەگازی خـەردەل‌و ماددەی عـاملی دەمـارگیری (سـارین و تـابوون‌و ڤـی ئـێكس)، بـەگوێرەی راپـۆرتی هەنـدێ سەرچـاوە (سـیانید)یـش بـەكارهێنراوە، لەوانەیـه جـۆرێكی نـاپوختی (تـابون) بوبێـت، كەپاشـەڕۆی (سـیانید)ی هەیـه، و تەركیبـەی سـیانیدی لێدەرچـووە، زۆربـەی ئـەو هەوڵانـەی ئەنجامـدراوە بـۆ گەشـەپێدانی ستراتیجی دژی چەكی بایۆلۆجی‌و كیمیاوی ئاراسته بووه بەرەو تاكه هەڕەشەیەك. هێرشەكەی سەر هەڵەبجه گرنگی پلان دانانی تـەكنیكی لەسەرخۆ ڕوون دەكاتەوە بەرەو زیاتر لـه یـەك ماددەی عامل وە بـەرەو زانیـاری موعەیـەن دەربـارەی كاریگەریـەكانی هەریـەك لـەم مـاددە عاملانه[٨] هێرشی پێچەوانەی عێراق لەچێشتەنگاوی ١٦ی مارتـەوە دەستی پێكـرد، بـه پـەلامارێكی ئاسـایی هێـزی ئاسمـانی‌و تۆپبـاران كردن لەشارۆچكەی سـەید سادقی لای باكوورەوە. زۆربـەی ماڵـەكانی هەڵەبجـه ژێـر زەمـینی سـەرەتاییان لـەنزیك ماڵـەوە دروسـت كردبـوو، هەنـدێك چوونه ئـەم ژێرزەمینانـەوەو ئـەوی دوای خەڵكەكـەش چوونه ژێر زەمینه حكومەتیەكانـەوەو ئـەوان هـەر لەسـەرەتای شـەڕی ئێـران – عێراقـەوە و لەسـاڵی ١٩٨٠ وە بەمـە ڕاهـاتبوون. یەكـەم شـەپۆلی

بۆمبارانی فرۆکە وادیاربوو بۆمبی ناپاڵم و فوسفۆریی تێدا بەکارهاتبوو، بەپێی قسەی شایەتحاڵێکی بۆمبارانەکە (ئەم بۆمبانە جیاوازبوون لەوانی تر، چونکە ئەمانە ناڵەیەکی یەکجار زل و گڕێکی یەکجار گەورەو توانای وێران کردنێکی لە ڕادە بەدەریان بوو، ئەگەر دەستت بدایەتە ئەو بەشەی لەشتەوەکە بەرکەوتبوو و گڕی تێبەربووبوو دەستیشت گڕی دەگرت، ئەو بۆمبە دەبووە هۆی ئەوەی هەموو شتێك گڕ بگرێت)) بۆمبارانەکە بێوچان چەند سەعاتێك بەردەوام بوو ((ئەمە تەنهایەك بۆمباران نەبوو کە بوەستێ هەناسەیەکی تێیدا بدەیت و پاشان یەکێکی تر دەست پێ بکاتەوە، بەڵکو بەردەوام فرۆکە دەهاتن ودەهاتن، شەش فرۆکە بۆمبارانیان تەواو دەکرد و شەشی دی دەهاتن[٩].

ئەوانەی بەدەرەوە لەسەر شەقامەکان بوون ڕوون و ئاشکرا دەیانبینی کە فرۆکەی عێراقی بوون نەك ئێرانی، چونکە هێند بەنزمی دەفڕین کەوا نیشانەکانیان بەئاسانی چاودێر دەکران. دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەو لەدەوربەری کاتژمێری سێدا ئەوانەی کەوا لە ژێر زەمینەکاندا مابوونەوە هەستیان بە بۆنێکی نائاسایی کرد. ئەمانیش وەك گوندنشینەکانی بەهاری ڕابردووی دۆڵی بالیسان بەبۆنی سێو و گوڵاو و خەیاریان دەشوبهاندو پیاوێکیش دەیوت ((بۆنەکەی زۆر پیس بوو و لەژەهری مار دەچوو)) کەواتە کەس پێویستی بەوە نەبوو پێی بووترێ ئەمە بۆنی چییە وادیاربوو پەلامارەکە بەشی باکووری شاری بەخستی گرتبووەوە دووربوو لەسەربازگەکانەوە، ئەگەرچی ئەو دەمە چۆلیش کرابوون لەژێر زەمینەکاندا لەپڕ ترس و سام و زەندەق چوونێك پەیدا بوو ئەو سەری نەبێتەوە هەندێك پەلە قاژەی ئەوەیان دەکرد درزو برینی دەرگای ژێر زەمین بەخاولیی تەڕ بگرن، یان پەڕۆی

تەرکراویان دەدابە دەمو چاویاندا و یان ئاگریان دەکردەوە، بەڵام دواجار هیچ شتێ دادی نەدان و لەناوا دەرپەڕینە دەرەوە بۆ سەر شەقامەکان، دنیا تاریك بوو بوو و هیچ ڕووناکییەکی سەرجادە نەبوو، چونکە ڕۆژی پێشتر ئاگری تۆپخانە کارەبای بەسەریەکدا تێکدابوو، خەڵکی هەڵەبجە لەبەر تروسکاییەکی کزی ڕۆشنایی دیمەنی مۆتەکەو کابووسیان بەچاوی خۆ دەبینی، لاشەی بێگیان، بەمرۆڤو ئاژەڵەوە، لارو پاڵ لەسەر شەقامەکان کەوتووبوون، لەسەر دەرکەو دەروازەکاندا کەڵەکە بووبوون، بەسەر ستێرنی ئوتومبیلەکانیاندا شۆڕبووبوونەوە، ئەوانەی کەهێشتا مابوون بەملاو بەولادا لەتریان دەداو هیستریا گرتبوونی و پێدەکەنین و دواجار بەلادا دەکەوتن، سەربازە ئێرانییەکان بەنێو شەقامە تاریکەکاندا تیژ تێدەپەڕین و بەرگی خۆ پاراستنیان پۆشیبووو دەمامکی گازیشیان بەدەمو چاوەوە بوو ئەو خەڵکەی کە هەڵدەهاتن بەزەحمەت ڕێگای خۆیان دەبینی و وایان هەست دەکرد کە ((دەرزی دەچەقێتە چاویاندا))و میزیان بووبوو بەخوێن[١٠] (جوناتان ڕاندل) کە ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگی ڕۆژنامەی (واشنتەن پۆستە) لەکتابەکەی‌دا ڕوبەڕووبونەوەکانم لەگەڵ کوردستاندا لەبەشێکی کتابەکەیدا بەناوی (مردو بۆ دۆزەخ ڕۆیشت) نووسەر باسی کارەساتی ئاوارە کوردەکان دەکات کەبەرەو چیا بەرزەکانی ئێران و تورکیا هەڵکشان ئەم جارەش کوردەکان پەندە بەناوبانگەکەیان دووبارە کردەوە کە جگە لەچیاکان هیچ هاوڕێکی دیکەیان نی‌یە ڕاندل دەڵێ:- ئەم جارە چیاکانیش نەیان توانی داڵدەی کوردەکان بکەن خودا دەزانێ چەندیان لێ مردن. ئەم پەندە بەتەواوی ڕاست نی‌یە چونکە لەکاتی تەنگانەدا بۆیان دەرکەوت کەهاوڕێی دڵسۆزیان هەیە شوێنی کاریگەری لە واشنتۆن و لەندەن و پاریسدا داگیرکردووە،

کارەساتە گەورەکان وەکو لێدانیان بەچەکی کیمیاوی لە ساڵی ١٩٨٨دا ئەنفال کردن، کوردەکانی ناچارکرد کە یەکگرن و بەرەیەك پێکەوە بنێن[١١].

## سەرچاوەکانی ئەم باسە:-

١. تقرير خاص الى الكونغرس الامريكي حول استخدام الاسلحة الكيمياوية، ترجمة امانج چاپخانەی صالح یوسفی١٩٨٨.

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣. رابوون، ژمارەی سێ، ساڵی ١٩٩٢.

٤. دراسات كردية ژمارەی چوار، ساڵی ١٩٩٣.

٥. مامۆستای کورد، ژمارە نۆ، ساڵی ١٩٩٠.

٦. رابوون، ژمارە سێزدە، ساڵی ١٩٩٥.

٧. گۆڤاری ئەنفال ژمارە (١) سلێمانی ساڵی ٢٠٠٠، ل٥٨

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩. میدل ئێست وۆچ، وەرگێڕانی سیامەندی موفتی زادە، جینۆساید لەعێراق داو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، چاپکراوی خاك، سلێمانی، ساڵی ١٩٩٩، ل٢٠٨.

١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو ٢٠٩.

11- Jonthan Randil: After South Knowledge what forgiveness Kurdistan.

# کوردستانی عیراق، ڕووداوو ژمارەکان دەپەیڤن

بەبیانوی پاراستنی سنوورەکان لەدەسەڵاتی جەنگاوەرانی دژ بەڕژێم، کاربەدەستانی عێراقی لە (١٩٧٥)ەوە شاڵاوی چۆڵکردنی دانیشتوانی لادێیە کوردنشینەکانی پیادە کرد، ئەم شاڵاوە تەشەنەی کردو زۆر فراوان بۆوە، بەڕادەیەك کەبەقەد ڕووبەری لوبنان هەرێمەکەی بەتاڵ کرد. باکووری عێراق لەپێنج ناوچە پێك دێت، سێیان ئەمانەن:- سولەیمانی، هەولێرو دهۆك، کەزۆربەی زۆریان کوردن و دەستوورو یاسای ئۆتۆنۆمی دەیان گرێتەوە.

ئەم زانیارانەی لای خوارەوە، کەلەسەر پێنج ناوچەکەیە پەیوەندیی یان بەژمارەیەك گوندی چۆڵ کراوەوە هەیە کەهەریەك لەم ناوچانە دەگرێتەوە.

١- ناوچەی سولەیمانی:-

- کەرتی ڕانیە پاش چۆڵ کردنی، ٤٢ گوندی سوتێنران.

- کەرتی هەڵبجە، پێنجوین، قەلادزە، دەربەندیخان، لە (٤٠٠) گوندان، (١٠٠) گوندیان سوتێنران.

- کەرتی مەیدان، هێرۆو شێخان لە (٢٤) گوندان، (١٦) گوند سوتێنران.

- کەرتی سەنگاو، لە (٢٧) گوندان، زیاتر لە (٨) گوندی تر لەدراوسێیەکان سەرجەمی (٤٩٣) گوند چۆڵکران.

٢- ناوچەی هەولێر (ئەربیل)

- کەرتی کۆیسنجق، لە (٢٤) گوندان، (١٦) گوندیان سوتێنران.

- کەرتی بارزان، (٢٤) گوند.

- کەرتی کەندیناوە، (١٤) گوند چۆڵکران، لە (٩) گوندان عەشائیری عەرەبیان نیشتەجێ کردن.

- کەرتی چۆمان، (٤٤) گوند.

- کەرتی سیدەکان، (٩) گوند.

- کەرتی دۆڵی تاڵەبان، (١٠) گوند.

- کەرتی زێبار، (١٦) گوند سوتێنران و بەبلدۆزەر تراشران.

- کەرتی مێرگەسوور، لە (٢٩) گوندان، (٢٥) گوند سوتێنران.

- لەکەرتەکانی تر، لە (٢٥) گوندان، (٢٤) گوند سوتێنران.

سەرجەمی (١٩٦) گوند.

٣- ناوچەی دهۆك:

- کەرتی سلیڤانی (٨١) گوند، عەشایری عەرەبیان لەشوێنی نیشتەجێ کرد.

- کەرتی زاخۆ، ئامێدی، (٧٢) گوند.

سەرجەمی (١٥٣) گوند.

٤- ناوچەکانی کەرکوك (تامیم)

- کەرتی دوبز، ئەلتون کۆپری، (٧) گوند، عەرەبیان لەشوێنی نیشتەجێ کردن.

- کەرتی قەرەحەسەن، (٢) گوند.

بێجگە لەوە، بەهەزاران لەدانیشتوانی کوردەکان کە لەشاری کەرکوك دەژین، کەسانی تری لەناوەڕاستی شارەکە چۆڵ کرد، چۆڵ کردنەکەشی بەمەبەستی دەستکاری کردنی دیمۆگرافی ئەم ناوچە، نەوتی‌یە دەوڵەمەندەیە، هەوەها ڕەتی بوونی کەمایەتی کوردی کردو لەناوچەی ئۆتۆنۆمی دابڕاند. سەرجەمی گوندە چۆڵکراوەکان (١٩) گوندن.

٥- ناوچەی نەینەوا (مووسڵ):

- کەرتی شەنگار (١٣٧) گوند.
- کەرتی شێخان (٨٨) گوند.
- کەرتی تەلەعفەر (٢٥) گوند. سەرجەمی (٢٥٠) گوند.

٦- ناوچەی دیالە:

- کەرتی خانەقین، (١٠٥) گوند چۆڵکران و بەدەیانی تر سوتێنران.
- کەرتی جەلەولا و مەندەلیش، گوندەکانی ئەم کەرتەشی گرتەوە. سەرجەمی گوندە چۆڵکراوەکانی ئەم ناوچەیە بەئاماری ڕەسمی (١٢٢٦) گوندن.

نامەیەکی ڕەسمی لەبەڕێوەبەرایەتی شەنگارەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی نەینەوا نێردراوە، هەڵگری ژمارە (٤٢٤٣) لەمێژووی ١٩٧٥، ئێمە بیرۆکەیەکی ژمارەی ئەو کەسانەتان دەدەینێ کەلەم کەرتەدا چۆڵکراون (٣٩) گوند، (٢٩٥٤) خانوو، ١٩,٥٠٣ کەسن. لەشێخان (٣٧) گوند، (٤٣,٥٠٠) کەسن سەرجەمی (٩٦) گوندو ٦٢,٥٠٣ کەسن.

ئێمە لەسەر بنەڕەتی ژمارەی (١٠٠) گوندان، دەتوانین بەئاسانی بڵێین کەژمارەی دانیشتوانی لادێیە چۆڵکراوەکان دەگاتە نیوملیۆن، کەشەش یەکی دانیشتوانی کوردە، لەلایەکی تر ئەو خاکەی کەبەقسە دەڵێن ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەپانایی‌یەکی زۆر کەم کراوەتەوەو دابڕاوەو بەزۆری عەرەب نشین کراون، بەم جۆرە (٤٢) گوند لەناوچەی هەولێر چۆڵکراون، بوونەتە پاشکۆی ناوچەی تأمیم و نەینەوا (نەخراونەتە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی).

شێوازێکی تری دوورخستنەوەی کوردەکان لەناوچەکەی خۆیان دا، بەبەردەوامی شوێنی کاریان دەگوێزنەوە بەتایبەتی ئەوانەی مووچەخۆرن بۆ دەرەوەی هەرێمی کورد نشین.

## ڕەوشی کۆمەلایەتی- ئابووری

چۆڵکردنی دانیشتوان، سوتاندنی گوندو دانەوێڵەکانیان پڕکردنەوەی سەرچاوەی کانیەکان‌و دەرمان تێکردن‌و قەدەغە کردنی گەڕانەوەیان بۆ گوندەکانیان، ئەم هەموو کردارانە کۆمەڵێ گیروگرفتی چێکرد بوو بەهۆی وێران بوونی ڕەوشی کشتوکاڵی، بەتایبەتی ئەم ناوچەیە بەناوبانگە بەمیوەجات‌و سەوزەو توتن‌و گەنم مەڕو مالآت بەخێو کردن.

لەسەدان کێڵگەی پەروەردەکردنی ئاژەڵ، حالّی حازر چەند دانەیەکی لێ ماوەتەوە، جوتیارەکان بەناچاری کەوتنە فرۆشتنی ئاژەڵەکانیان بەنرخێکی هەرزان‌و بەجێهێشتنی گوندەکانیان‌و گرتنەبەری ڕێگای نادیار. دیارە گیروگرفتێکی تر سەری هەڵدا، بەتایبەتی بێئیشی جوتیارەکان‌و بێبەش بوونیان لەزەویەکانیان، بەشێکی زۆریان بێ خانووو بێ زەوی سۆز پێدراو مانەوە، سەرەڕای پڕۆپاگەندەی بەربلاوی میری بۆ قەرەبووی خانووەکانیان. ئەم مامەڵەکردنە خراپەو کوخی پیس‌و ئازارو ناڕەحەتی چەشتن‌و کەم دەرمانی بوونە هۆی بلاوبوونەوەی پەتا.

## بەعەرەب کردن و چەوساندنەوەی ڕۆشنبیری:

بــەگوێری بــەیانی (١١)ی ئــازاری (١٩٧٠) کەلەبابــەت کێشــەی نەتــەوەیی کــوردە، قوتابخانەیــەکی زۆر دەبوایە لەناوچــەی کوردەکـان بکرێتەوەو وانەی نــوێ تێدا بوترێنــەوە، ڕێـژەی وەرگیراوی قوتابیـانی کــورد لــەزانکۆکان زیــاد بکــرێن، پێرستــە لەقوتابخانــەی ســەربازیش هاوشــان بــێ، هــەروەها زەمالــەش بــۆ قوتابیــانی کــورد دابــین بکــرێ. ســەرەڕای بــوونی ئــەم بڕیارانــە، قوتابخانەیــەکی یــەکجار زۆر لەوانــە ووتنەوە بەزمانی کوردی داخراون، پەنا بردنە بەر بیانوی جۆراو جۆر بۆ سەپاندن و گەڕاندنەوەی وانە ووتنــەوە بــەزمانی عــەرەبی بۆ نموونــە کــەمو کــورتی لــەزمانی کــوردی داخــران، پــەنا بردنــە بــەر بیــانوی جۆراوجۆر بۆ سەپاندن و گەڕاندنەوەی وانە ووتنــەوە بــەزمانی عــەرەبی بــۆ نموونــە کــەمو کــورتی لــەزمانی کــوردی کەچــی عــەرەبی زمــانی بڵاوکردنەوەی ناچارییە، هەروەها بەکارهێنانی هێـزو گوشار خستنە ســەر دایکــان و باوکــانی قوتابیــان کەمەزبەتــە واژۆ بکــەن و داوای ئــەوە بکــەن کەووتنــەوەی وانــە بــەزمانی عــەرەبی بــێ نــەك زمــانی کــوردی، زمانەکەیان زمانی دایکانە دەبێ. میری ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩ بڕیارێکی پەسەند کرد کە ٥٠٪ی پڕۆگرامــی خوێنــدنی قوتابخانــەی مامۆستایان بــەزمانی کــوردی بــێ، بەناچــاری کــرا بەعــەرەبی، بەتایبــەتی لــەبواری زانستە مۆرڤایەتیەکان، لەکتێبی خوێندنگا هــیچ ئاماژەیــەك بەمێـژووو ئــەدەب و ڕۆشــنبیری کــورد نــەکراوە. لەلایــەکی تــر ئــەو کتێبانــەی کــە لەسەر ئەم بابەتانە بوون لەکتێبخانە گشتییەکاندا کێشایانەوە.

هورووژمی قەڵاچۆکردنی نەخوێنــدەواری بــەزمانی عــەرەبی ڕەفتــاری لەگەڵدا کراو دانیشتوانی لادێکانی کوردستانی پشت گوێ خست،

ناوی قوتابخانەکان، میوانخانەکان، چێشتخانەکان، هەرەوەزەکان... هتد هەمووی ناوی عەرەبیان خستنە شوێنیان.

ڕۆشنبیرانی کورد، بەرهەمە ئەدەبی و هونەریەکانیان بەهەموو جۆرێك ملکەچی پەژارەو تەوژم دەبوٚوە وبزوتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی دوورە پەرێز دەکرد پێویستە ئەوەش تۆمار بکرێت، کەگەلی کورد نوێنەرایەتی چواریەکی وولاتن، ڕۆژنامەیەکی هەفتانە، مانگانە بەزمانی کوردی نییە. میری دەستی بەسەر هەمووی داگرتییە، بێشك ئەم کارانە پێچەوانەی یاسای ئۆتۆنۆمییە، کەڕوونی کردۆتەوە کەوانە ووتنەوەی کوردی و دانان بەزمانی کوردی دانیپێدانراوە، هەروەها بۆ هەموو کەمینەکانیش کە لەعێراقدا دەژین.

## نموونەی ئازاردان

بەکورتی ڕۆژانە گرتن جێبەجێ دەکرێ، خەڵکی بەبیروباوەڕی جوداوازو تەمەنی جۆر بەجۆرەوە دەپێکرێن ئەوان پەنا دەبەنە بەر بیانوو بەهەر شێوەیەك بێ. بۆ نموونە هەر ئەندامێکی خێزانەکە سەر بەیەکێتی جەنگاوەرانی دژ بەدیکتاتۆر بێ، بیانوو بەدەستەوە دەدا، کەهەموو ئەندامەکانی خێزانەکە بەند بکرێن. (لەوانە منداڵەکان و پیرەمێردەکان) بەرەو باشوور مەڵبەندی وولاتیان دەبەن. کەوابوو هەندێ لەساڵی ١٩٦٦-١٩٦٧ لەنوێ دەستگیرکران و بەتوندی ئازارو حوکم دران، لەوانە سزای کوشتن بەبیانووی پڕوپووچ. کە (١٢ ساڵیش بەنهێنی لەپێش وەخت بەئەنجام دەگەیەنرێ)، بێجگە لەوە کوردەکان کەلەژێر دیکاتۆرن یەك چارەنووسی، کتوپڕی بەندی کردن، ئەشکەنجەدان، لەسێدارەدان، تۆقاندن، چاوەنواڕیان دەکات.

## ئه نجام

دووپـاتی دەکەینـەوە کـەڕژێمی عێراقـی نـەڕێزی یاسـای ئۆتۆنـۆمی نـە ئـەو دەسـتوورانەی بڕیاریـان دراوە بـەلابردنی هـەموو دەسـت درێژیـیـەکی گـەلانی عێـراق (عەرەبـەکان و کوردەکـان) کەبەتێکۆشـانی دوورو سـەخت بەدەسـتی‌یان هێنـاوە، بێجگـە لـەوە ڕژێمـی عێراقـی پـەنای بردۆتـە بـەر پـەیمان و ڕێککەوتننامـەی سـاڵی (١٩٧٥) کەلەلایـەن سـەدام حوسێن)ەوە واژۆکـراوە لەگـەڵ شـای ئێران دا، پاشـان هـەر لەلایـەن خـودی خۆشـیەوە حاشـای لێ کـراوە، لەڕۆژنامـەی (میللی‌بـەت)ی تـەرکی پوختەیـەکی بڵاوکراوەتـەوە لـە (٢٥)ی ئاگوسـتی ١٩٧٨دا. چـوار مـەرج لـەو بەنـدەدا دیـاری کـراون، هـەردوو بـەش هـەموو پێوانەیـەك بـەکار دەبـەن بـۆ کـپ کردنـی هـەر چالاکی‌یەك کەلەسنوری هـەردوو وڵاتـدا بـەڕێوە بچـێ. لەهـەمان کاتـدا بەنـدی (١،٢،٣) بـاس لـەکۆنترۆڵ کردنـی سـنوور دەکرێـت، بـۆ ڕێـك خستنی کۆتایی هێنان بەدەرباز بوونی کەسەکان، گۆڕینەوەی زانیاری خێـرا بـۆ هـەر ڕووداوێـك، بـۆ گـرتن و دانـەوەی تاوانبارەکـان. هـەردوو حکومەت ئازادن کـە (١٧) کـم هێـزی ئاسمانی‌یـان بچێتە نـاو سنووری وڵاتی یەکترەوە، ئامانجی گەورەی ئەم هورووژمە کەلەلایـەن دیکتـاتۆری عێراقـەوە بـەڕێوە چـوو بـۆ تواندنـەوەو ناچـار کردنـی گـەلی کـورد، لەهـەمان کاتـدا نەهێشـتنی دەنگـە جوداکـان، یـان بۆچـوونی سەربەخۆیی، هەموو جۆرە ڕێکخراوێکی سیاسـی، کۆمەڵایـەتی یـاخود نەقابی.

ئەم بابەتەم لە فەڕەنسیەوە وەرگێڕاوە لە:

1- Comite Francais contre la repression en Irak, Nons Condamnons, Paris, 1981. P25-30.

## دەنگ دانەوەی ڕاپەرینەکانی عێراق لەدەرەوەی وڵات دا

ڕاپـــەڕینی ئـــازاری ١٩٩١ وەرچـــەرخانێکی گـــەورە بـــوو عێـــراق بەخۆیـــەوە بـینی، پـاش گەڕانـەوەی سـەربازەکان لـە بەسـرا ڕاپـەڕین دەسـتی پێکـرد، بـەم جـۆرە لـە ٣/٢دا لەبەسـرەوە بـەرەو عیمـارە و ناسـرییە، پاشـان بەرەو نەجـەف و کەربـەلا چوون، لـە کوردستانیشـدا سـەرەتای راپـەڕین لـە ڕانیـەوە پشـکۆی ئـاگر هەڵەبجـەو چەمچـەماڵ و کفری و کەلار و دەربەندیخان و شەقڵاوە و ڕەواندوزی گرتـەوە، لـە ٢/١١ ڕاپـەڕین گەیشـتە هـەولێرو پاشـان خانـەقین و دوزخورمـاتوو، لـە ٣/١٤ زاخـۆو دهـۆك و ئامێدی رزگـاربوو، لـە ١٩/٣/٢٠ شـاری کـەرکوك رزگـار کرا.

### هۆکارەکانی ڕاپەرین چی بوو:-

١- شکانی لەشکرەکەی لە گەردەلوولی بیاباندا.

٢- تـوڕەیی و نـاڕەزایی خـەڵکی عێـراق لـە ئـەنجامی هەشـت سـاڵ شەڕی نێوان ئێران و عێـراق ، جگـە لـە ئـەنفال و کیمیاباران و کوشـتنی بەکۆمـەڵ، ئەمانـە هـەموو بەسـەر یەکـەوە ئاسـاری خراپـی بەسـەر دەروونی خەڵکی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی بەجێهێشت.

٣- گەمارۆی ئابووری، بەمەش عێراق زیانێکی گـەورەی لێکـەوت، بەزۆری کاری لەسەر دانیشتوانی عێراق کرد نـەك دارو دەسـتەی رژێم چونکە دارو دەستەی رژێم تـاکو ئێسـتاش لەدروسـت کردنـی کۆشـك و تـەلارو سـەرف کردنـی داراییـدا درێخیـان نـەکردووە. ئـەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە وروژاندنی خـەڵکی عێـراق دا دەسـتیان تـا ڕادەیـەك

هەبوو، لە ١ ی ئازاری ١٩٩١دا جۆرج بۆش گووتی:- ئەگەر گەلی عێراق سەددام لەناوببات، هەموو گیروگرفتەکان چارەسەر دەکرێن عێراقیش بۆ خێزانی نێو نەتەوەیی دەگەڕێتەوە. هەروەها لە ٣/١دا لە پرسیارێکدا کە ئاراستەی وەزیری بەرگری فەرەنسا (بیار جۆکس) کرابوو، لەبارەی چارەنووسی سەرۆکی عێراقەوە لەوەڵامدا ووتبوی:- پێویستە باوەڕ بەعێراق یەکان بسپێرین، وەزیری دەرەوەی بەریتانیاش (دۆگلاس هێرد) ووتی:- عێراق ناتوانێت بۆ کۆمەڵگای نێو نەتەوەیی بگەڕێتەوە تاکو سەددام لەفەرمانڕەواییدا بێ.

لەسەرەتای ڕاپەڕیندا میدیاکانی ئەوروپا بەگەرمی باسی ڕاپەڕینی خەڵکی عێراق یان کرد، بۆیەکەم جار مسیۆ میتران سەرۆکی دەوڵەتی فەرەنسا لە شەوی ١٩٩١/٢/٣دا، لە تەلەفزیۆن ڕایگەیاند کە فەرەنسا پاش نەمانی شەڕی کەنداو بۆ ئاشتی و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی فەلەستین، لوبنان، کورد، کاردەکات، لەرۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی ٣/١دا بەناوی دۆسیەی ئاشتی‌یەوە هەمان پرۆژەی حکومەتی فەرەنسا بلاْوکراوەتەوە کە:-

لە ١٩٩١/٨/٢ وەزیری فەرەنسا (رۆلاند دۆما)گەیاندییە نەتەوە یەککگرتووەکان لەنیۆرکدا، گۆڤاری نۆڤێل ئۆبسرڤاتۆری فەرەنسی دەنووسێ:- لەپاش شەڕی کەنداو، کوردەکانی عێراق کە سەددام حسێن بەر لە سێ ساڵ بەگازی کیمیایی بۆمبارانی کردن دەستیان بە ڕاپەرین کردووە، لەلایەن ئەمریکاوە هاندراون و ناوچەیەکی ئازادیان لەباکووری عێراق بۆ چێ کرا.

داگس (dagsnyheter) نیهێتەری سویدی دەنووسێ و دەڵێت:- دوای شەڕی کوێت، عەرەبە شیعەکانی خوارووی عێراق دژی ڕژێمی عێراق ڕاپەرین، بەڵام سەددام حسین توانی دایان بمرکێنێتەوە، بەڵام

کوردەکان بە هۆی پاڵپشتی ئەورووپای رۆژئاوا توانرا ناوچەیەکی سەربەخۆیان لە سەرووی عێراق لە هێڵی (٣٦) بۆ دابمەزرێنرێ.

٤- بەگشتی هەڵوێستی ئەورووپییەکان لەسەرەتادا زۆرباش بوو بەڵام هەڵوێستی عەرەبەکان، بەتایبەتی عەرەبەکانی سەرووی ئەفریقا، ئوردن، فەلەستینەکان زۆر خراپ بوون. کوردەکانیان بەوە تاوانبار دەکرد کە بزوتنەوەکەیان، بزوتنەوەیەکی جودا خوازیانەیە، دژ بەعەرەب و ئیسلامە، پەیوەندی بە ئیسرائیلەوە هەیە، ئەگەر خۆیان گێل نەکەن و ئاورێك لەسیاسەتی وڵاتە عەرەبییەکان بدەنەوە، بۆیان دەردەکەوێ کەسیاسەتمەدارە عەرەبەکان لەهەموو کەس زیاتر هەوڵی پەیوەندی و دۆستایەتی ئیسرئیل دەدەن، تەنانەت عێراقیش کەئەوان بە پاڵەوانی عەرەب و ئیسلامی دادەنێن ئەگەر ئیسرائیل ئاوڕیان لێبداتەوە ئەوا بێشك لەخۆشیاندا قوڕ دەخۆن، کوردەکان لەسەر خاکی باوك و باپیرانی خۆیانن نایانەوێ لەسەر خاکی گەلێکی تر دەوڵەتیان بۆ دروست بکرێت لەخاکی خۆمانەوە بەکردەوە بەرگری مان لەماف فەلەستینییەکان کردووە، کەچی ئەوانیش لەپاداشتی ئەم کارە ناجوامێری خۆیان پیشاندا لەپاش ڕاپەرین پشتی رژێمی بەغدایان گرت و کەوتنە گیانی خەڵکی بە شەرەف عێراق و کوردستان، ئەمڕۆش خەریکن پیلانێکی تر جێبەجێ دەکەن لەجیاتی قودسی دۆڕاویان، دەیانەوێ کەرکوکی خۆشەویستمان داگیر بکەن، دیارە خەیاڵیان خاوە، رۆژی ئازادی هەندەی نەماوە.

گۆڤاری تیمپۆسی سویدی دەنووسێ:- پاش رزگارکردنی کوێت ئەمریکا وای حساب کردبوو کە بە کودەتایەك، کارەکەیان مەیسەر دەبێت بەڵام یەکێك لەگەورە پیاوانی دەوڵەت (جۆرج بۆش)ی ئاگادار کردەوە کە ئەمە کارێکی ئاستەنگە بەڵام خانووی سپی باوەڕی وابوو

کەدەتوانێ کۆتایی بە رژێمی عێراق بهێنێ، لەمانگی گوڵاندا یا درەنگتر لەخەرماناندا، بەڵام سەددام حوسێن لەمانگی جۆزەردانیدا توانی سەد ئەفسەرو پاسەوانەکانی بگرێت کەبەتەمای کودەتا بوون بەمەش گرنگترین پاڵ پشتی (CIA) کۆتایی پێهات لەلایەك بەکەشف بوونی پیلانی ئەمریکا، لەلایەکی ترەوە وابڵاوکرایەوە کە ئێران لەرێگای فاوەوە لەشکر بەرەو عێراق دەنێرێ، لۆمۆندی فەرەنسی بەوێنەی کاریکاتێرەوە ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر ئەوروپیەکان بەجێهێشت، بۆیە دەبینین کەگۆڕان بەسەر هەڵوێستیاندا هات. لە ١٩٩١/٣/٤ وەزیری بەرگری فەرەنسا (رۆلان دۆما) لەگفتوگۆیەکی ئێزگەی ئەوروپا ووتی :- فەرەنسا هیچ مەبەستی لەگۆڕینی رژێم نییەو بەشداری لەدوورخستنەوەی سەددام حسێن لەدەسەڵات ناکات. لە١٩٩١/٣/٥دا (جۆرج بۆش) ووتی:- ئێمە دەست ناخەینە ناوکاروباری ناوخۆی عێراقەوە، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (دۆگلاس هێرد) ووتی: دیاریکردنی فەرمانڕەوایی عێراق کاری هاوپەیمانان نییە،

هەرچەندە لە (٣/٦)دا ریتشارد باوتشیز، زمان حاڵی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بڵاوکردەوە کەهیچ بەڵگەیەك نییە کە ئێران لەپشت ئاژاوە بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا لەرێگای بارزان تکریتییەوە عێراق ئاگادارکراوە، کەدەتوانێ فرۆکەی کوژەر بەکاربهێنێ (وەفیق سامەرائی) سەرۆکی موخابەراتی عێراقی لە١٩٩٦/٣/١٢دا لە (نداء الرافدین) بڵاوکردەوە لەکاتی ڕاپەرین بەهۆی گوێگرتن لەتۆڕی لاسلکی بەشی ناصریەوە، ڕاپەڕیوەکان داوایان لەهاوپەیمانان کردووەکە بەهەر شێوەیەك بێت یارمەتیان بدەن، وەڵامیان داونەتەوە کەیارمەتی کۆمەڵەی سەید واتە

(خوئی سەرۆکی شیعەکانی نەجەف) نادەین، جارێکی تر بەناوی شۆڕشگێڕەوە چوون، دیسانەوە پێیان وتوون ئێمە یارمەتی شیعەی نادەین و ئێوە شیعەن، بەم جۆرە بە ئاگرو ئاسن کەوتنە گیانی خەڵك، (وەفیق سامەڕائی) دەڵێ:- لەشاری کەربەلا بلاۆکراوەمان پەخش کرد کە ئەگەر شار بەجێ نەهێڵن ئەوا بەچەکی کیمیاوی لێیان دەدرێ بەهەر حاڵ توانیان ڕاپەڕینی خواروو و سەرووی عێراق دابمرکێننەوە، کاتێ راپەرینی خەڵکی عێراق یان نقوومی خوێن کرد، زیاتر لە ملیۆنێك کورد بۆ چیاکانی ئیران و تورکیا ڕایان کرد، نەتەوە یەکگرتووەکان لەرێگای ئەنجومەنی ئاسایشی نێو نەتەوەیی یەوە، بڕیاری (٦٨٨) یان دەرکرد، کە عێراق بەخێرایی دەست لەدانیشتوانی مەدەنی هەڵبگرێ. لە (١٦)ی نیسان (جۆرج بۆش) ڕایگەیاند کەناوچەیەکی پارێزراو لەنزیك سنوری تورکیا بۆ کوردەکان چێ دەکات، داوای لەهێزی سەربازی عێراق کرد کە(٢٥)میل لەخوارووی سنوری تورکیا چۆل بکات و هێڵی (٣٦) لەفرۆکەکانی عێراق قەدەغە کرا.

## بۆچی را پەرین لەناو چوو:-

١- سەرکردەی بزوتنەوەکە لەخوارووی عێراق ، سەرکردەیەکی شیعە بوو کە هیچ ئەزموونێکی سیاسی نەبوو، زۆر زانیاری خراپ لەلایەن ڕژێمەوە بەناوی سەید (خوئی)یەوە بلاۆدەکرانەوە، لە٥/٣/١٩٩١دا سەید (خوئی) داوای لە شۆڕشگێڕەکان کرد کە پەیڕەوی شەریعەتی ئیسلام بکەن (تەها جەزراوی) لەنەجەف لەگەڵ هەوادارەکانی لەناوی بردن هەروەها سەید (عبدالله علی السبزاوی) لە ٣/٣/دا جیهادی ڕاگەیاند ئەویش نەیتوانی شتێ بکات.

٢- لەنێوان خواروو و باکووردا هیچ یەکخستنێك نەبوو، ئەمەش یارمەتی سەددامی دا کە بە ئاسانی بەسەریاندا زاڵ بێ.

٣- شۆڕشگێڕەکان لە شارەکان مانەوە، هەڵەیەکی گەورەیان کرد بەرەو بەغدا نەچوون، چونکە بە گرتنی بەغدا هەموو شتێ کۆتایی دەهات.

٤- لەکوردستاندا نەتوانرا سوود لە ١٠٠ هەزار سەرباز وەربگرێت، بۆ هەڵگرتنەوەی مین، بەکارهێنانیان بۆ چەکە قورسەکان، بەم جۆرە چ لەکوردستان چ لە باشوور سەربازەکانیان بەڕەڵڵاکردن بێ ئەوەی لەو هێزە سوود وەربگرن.

٥- کوردەکان کاتێك کەرکوکیان رزگار کرد لەماوەی دوو هەفتەدا نەیانتوانی شوێن پێی خۆیان قایم بکەن و ئەو شوێنانەی ئازادیان نەکردبوون ئازادی بکەن، رۆژنامە نووسێکی فەرەنسی نووسی بووی کوردەکان لەجیاتی سەربازگەکان بەتەواوی رزگار بکەن خەریکی کاری لابەلابوون.

# کۆمۆنیزم بەرەو کوێ

هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١دا، دیاردەیەکی کتوپڕ نەبوو، بەڵکو هەر لەساڵی ١٩٧١دا، (هێلین کاریدانکۆسل) لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا (ئیمپراتۆریەتی تەقێنراو)دا پێش بینی کردبوو، هەروەها (ئەندریە سینافسکی) نووسەری ناوداری روس هەمان بۆچوونی هەبوو، بەر لەڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت بەسێ ساڵ وتبوی لەمێژوودا ئیمپراتۆریەتێکی نەمر نییە، زوو یاخود درەنگ ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی ئاش بەتاڵی لێدەکات، کەچی (دانیل یۆرگان و سان گوستافسۆن) دەڵێن لەمێژوودا ڕووداوی گەورە ڕوودەدات، کەچاوەڕوان نەکراوبێت، وەك دیاردەی کتوپڕی تێکشانی یەکێتی سۆڤیەت، سەرۆکی وەزیرانی پێشووی بەریتانیا (ئەنتون ئەیدن) لەکتێبەکەیدا کەباسی تاقیکردنەوەی سیاسی خۆی دەکات و دەڵێ:- لەسەدەی بیستەمەمدا گەلان لە چارەسەرکردنی قەیرانی وڵاتەکەیاندا سەرکەوتن وە دەست ناهێنن، پاشان دەڵێ:- شتێکی موستەحیلە کەلەمێژوودا بخوێنینەوە کە نەگەینە ئەو ڕایەی کەهەردەم دەستەیەك بڕیار دەردەکەن و بڕیاری تاقە هەنگاوی دواکەوتوو، کەهەنگاوی کوشندەیە. مانای وایە کە ڕووداوی گەورە بەرەو ڕووی پرسیارەکانمان دەبنەوە.

دیاردەی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت گەلێ هۆی دەرەکی و ناوەکی هەیە، لەمانە:-

## هۆی دەرەکی:-

ئیمپریالیزم و ولاتانی سەرمایەداری نزیکەی حەفتا ساڵە لەکنەکردن دان بۆتێك دانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەم مەبەستەش (حەیاتی لەندەنی) ئیعتراف سیناتۆرێکی ئەمریکی بلاوکردبوۆوە، کەتێیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات، نەخشەو پیلانەکانی ئەمریکا سەری گرت، ئەویش بەلەخشتە بردنی (گۆرباتشۆف) کاتێ لەئەمریکادا سەفیری سۆڤیەت بوو.

گۆرباتشۆف لەکتێبەکەیدا پێریسترۆیکا دەڵێت:- پێرسترۆیکا ئارەزووی تاکە کەسی و کۆمەڵە کەسایەتیەك نییە، تەنانەت حیزب بوو کۆنگرەی حیزبیش ناتوانێ خەڵك بورژێنێ بۆ ئەم بزوتنەوەیە، بەڵکو لە قولایی پرۆسەی پێشکەوتنی کۆمەڵی ئیشتراکی سەری دەرهێناوە، دیارە قسەکەی دوورە لە مەنتیق چونکە کۆمەڵی ئیشتراکی ئەگەر پێشبکەوێت ئەوا بەرەو کۆمۆنیزم دەچێت و بەرەو دواوە ناگەرێتەوە ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە موڵکایەتی تایبەتی قەت لە موڵکایەتی گشتی باشتر نەبووە، کەچی گۆرباتشۆف دەڵێت: موڵکایەتی تایبەتی سوودێکی کۆمەلایەتی هەیە لەجیهانداو موڵکایەتی دەوڵەت لای ئێمە ولاتی بەرەو تەنگژەو گیروگرفت بردووە.

## هۆی ناوەکی:-

١- دواکەوتنی شۆرشی زانستی تەکنەلۆژیا لەبەشە جیاجیاکانی ئابووری‌دا، بەتایبەتی لە رووی کوشتوکاڵییەوە تەنیا لەرووی سەربازییەوە نەبێ کەهێزێکی مەزن و بەتوانابوو کە بتوانێ بەربەرەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکات.

٢- سەندیکا دوور بوو لەوەی هۆیەك بێت بەدەست دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاوە، بەڵکو ئامرازی دەستی دیکتاتۆریەتی برجوازی دەوڵەت بوو، دەوڵەتی گەل پێکهێنرا، ئەمیش بەشێوەیەکی بیرۆکراتی کارەکانی ئەنجام دەدا و کۆمەڵگای بێ چینایەتی دواخرا بۆکاتێکی تر.

٣- لەمەیدانی مافی مرۆڤدا، هەر مەپرسە چۆن ئازادی بیروڕا پێشێل دەکرا.

بوونی ژمارەیەکی زۆری گرتوخانە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە گیروگرفتی قووڵی کۆمەڵایەتی هەبووە، هەرچەندە گرتووەکانیش گرتووی سیاسی بەرهەڵستکار نەبوونە، بەڵکو گرتووی گشتی بوونە هەندێکیان بەهۆی قسەو نووسینەوە بووە، بۆ نموونە (ئۆنیا تۆشنیکایا) حەوت ساڵ حکوم درا، پێنج ساڵی تریش دوورخرایەوە بەتاوانی ئەوەی چەند شیعرێکی نووسیبوو، پەردەی لەسەر کارە ناڕەواکانی رژێمی سۆڤیەتی لاداوە.

(باسترناك) بەهۆی نووسینی رۆمانی (دکتۆر ژیڤاگۆ)دا لەیەکێتی نووسەرانی سۆڤیەت دەرکرا، ناوی نووسەری سۆڤیەتیان لێ سەندەوە، ئینجا راپۆرتێکی پولیسیانەشیان بۆ لیژنەی مەرکەزی پارتی کۆمۆنیستی نووسی لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبویان هاونیشتمانیی سۆڤیەتی لە (باسترناك)ی خائین وەربگرنەوە چونکە ئەو گەل و نیشتمانەکەی فرۆشتووە، یەکێتی لاوانی کۆمۆنیستیش نامەیەکی بۆ لیژنەی مەرکەزی پارتی کۆمۆنیست نووسی، داوای دوورخستنەوەی باسترناکی دەکرد، باسترناکیش نامەیەکی بۆ خرۆشۆف هەنارد لەنامەکەیدا نووسیبووی:- (دوورخستنەوە بۆ من وەك مردن وایە، داواکارم چارەنووسی وام تووش نەبێت) هەر چۆنێك

بوو دوور نەخرایەوە. ئەمەش دوائەوتوویی بیری حیزبایەتی دەگەیەنێ. پاش پیرسترۆیکاو کلاسنۆست ئایا روسیا توانی بازاڕی ئازادو دیموکراتیەتو دەوڵەتی نەتەوەیی نوێ ئەنجام بدات، ئەمە پرسیارێکە و وەڵام دانەوەی شتێکی ئاسان نییە، جارێ لەڕووی ئابووریەوە شتێکی موستەحیلە کە ببێتە وڵاتی سەرمایەداری چونکە سەرمایەداری بەرۆژو ساڵ دروست نابێت، هەروەها سەرمایەداری قوربانیەکی زۆری داوە، تاگەیشتۆتە ئەو ئاستەو روسیا ئەم توانایەی نییە.

لەساڵی ١٩٨٦دا گۆرباتشیۆف ڕازی بوو بەوەی کەواز لە ئەورووپای رۆژهەڵات بهێنێو لەگەڵ ئەڵمانیادا ڕێکەوت بەرامبەر بەوەی ئەڵمانیا قەرزێکی بەنرخی سێ ملیار دۆلاری بداتێ پاشان دوانزە ملیار مارك بۆ ئەوەی خانووبەرە بۆسەربازە گەڕاوەکان بکات، لەکۆتایی ١٩٩٠دا کۆمەڵی ئەورووپی بەرنامەیەکیان خستە ڕوو بۆ هاریکاری کاری ئابووریو خواردەمەنی مرۆڤایەتیو دروست کردنی بانکی ئەورووپی، تەنانەت ئەمریکا بایی یەك ملیار دۆلار کەلوپەلی بۆ رووسیا نارد، هەموو ئەم شتانە دڵۆپێك بوون لەدەریایەکدا، بەتایبەتی پاش هەرەس هێنانی گۆرباتشیۆف لەساڵی ١٩٩١داو دەسەڵات کەوتە دەست (یلتسن). لەساڵی ١٩٩٢دا حەوت وڵاتە سەرمایەداریکان ڕایانگەیاند کەپاڵپشتی رووسیا دەگرن بە مقداری (٢٤) ملیار دۆلار دوایی بینیان ڕوسیا پێویستی بە (٤٣)ملیار دۆلار هەیە، پاش ساڵێکی تر بە (٨٠) ملیار دۆلار ئەورووپای رۆژئاوا لەتوانای دانەبوو کەمیریو پەرلەمان ڕازی بکات لەزیاتر پاڵپشتی کردنی ڕوسیا بەتایبەتی خۆشیان بەرەنگاری قەیرانی ئابوری بوونەتەوەو بێکارییەکی گەڵێ زۆریان هەیە، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی

کەدەستبەرداری ڕوسیابن.. دابەزینی بەرهەمی پیشەسازی لە ساڵی ١٩٨٩دا بەڕێژەیەکی یەکجار زۆر بۆ نموونە لەکۆماری تشینیا ٣٨٪ بۆلونیا ٢٦٪ سیلۆفاکیا ٢٦٪ ئەمەش بووە هۆی بێکارییەکی زۆر، دەزگاکانی ئابووری قەرزێکی زۆریان لەسەرە، بۆیە نەیان توانی بایەخ بەنوێکاری بدەن، ناردنە دەرەوەی بەرهەمی پیشەسازی بەرەو خراپی دەچوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەبەرهەمێکی زۆر کۆبێتەوە ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە، دەرگا لەدەرەوە کردنەوە بووە هۆی ئەوەی کەپارەیەکی زۆر بچێتە دەرەوە وەك لە پۆڵەندا ڕوویدا، تێکچوونی بازاڕی هاوبەش لەوڵاتە ئیشتراکیەکانی پێشوو کارێکی خراپی کردە سەر ئابووری وڵاتە سۆشیالیستەکان، جاران بە نرخێکی هەرزان گازیان لە یەکێتی سۆڤیەت دەکڕی ئەمڕۆ بە نرخێکی جیهانی لە رووسیای دەکڕن، نرخەکەشی بە دۆلارە نەك بە گۆڕینەوەی کەلوپەل کەجاران ئەنجامیان دەدا، ئەوروپای ڕۆژئاوا دوو دڵن لەوەی کەبازرگانی لەگەڵ ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا بکەن، چونکە دەترسن کەبەرهەمی هەرزانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات لەوڵاتەکەیاندا بێکاری زیاد بکات ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا ڕژێمێکی تەشریعی تایبەتی نییە بەتایبەتی لەڕووی زەریبەو موڵکایەتی تایبەتەوە، هەروەها ئیدارەیەکی کارامەو نوێیان نییە.

بەرهەمی نەتەوەیی روسیا لەساڵی ١٩٩٠دا نزیکەی ٤٠٪ی هاتۆتە خوارەوە، لەهەمان کاتدا شەڕێکی بەرفراوان هەیە لەپێناوی دەست بەسەر داگرتنی دەسەڵات لەلایەك،لەلایەکی ترەوە دەست بەسەر داگرتنی موڵکایەتی شەڕێکە هەموو تێیدا بەشداری دەکەن، لەپێناوی سەردەمی پێشوو بەتایبەت جودا خوازەکان، ئەوانەی گەڕاونەتەوە، پیاوانی سیخوڕی پێشوو، گەورە پیاوانی میری، تەنانەت

جەنەڕاڵـەکانیش ئـەمڕۆ هـەوڵی مـۆرکردنی ڕێککەوتننامـە لەگـەڵ ئـەمریکاو شـەریکاتی ڕۆژئـاوا دەدەن. تێکـڕا هەڵئاوسـان لەسـاڵی ١٩٩٢دا ((٪١٠٠))بوو. لەساڵی ١٩٩٤دا ژمارەیەکی قیاسی جیهانی بوو لـە ٪٢٥ . بـەجۆرێك ڕۆبـل دابـەزیوە کـەڕاتبی فەرمانبـەرێك (١٦٠٠٠) ڕۆبڵە دەتوانێ سێ کیلۆگرام گۆشتی مەڕی پێ بکڕێ.

لـەڕووی سـەربازییەوە، دوا ڕۆژی سـەربازی ڕووسـی نادیـارە، بەتایبـەتی لەشـەڕی چیچانەکاندا دەرکـەوت کە سـەرکردەکانیان ڕاڕان لەشەڕەکەدا بەهەزارەها ئەفسەرو سەرباز و خێزانەکانیان لە ئەورووپای ڕۆژهـەڵات گەڕاونەتـەوە کـەژمارەیان (١٥٠)هـەزار دەبێـت بـێ شـوێنن، چاوەنواڕی ئەو پیلانـە دەکـەن کـە ڕوسیا لەگـەڵ ئـەڵمانیای ڕۆژئـاوادا مـۆری کردبـوو، کەلـەکاتی گەڕانەوەیانـدا خانووبـەرەیان بـۆ جێبـەجێ بکـات، لـەڕووی چـەکەوە نزیکـەی سـێ هـەزار چـەکی نـەوەوی لەگـەڵ عـەمبارێکی پـڕ لەچـەکی کیمیـاوی هەیە، لەگـەڵ چـەند هـەزار چـەکی نەوەوی لە ئۆکرانیاو کازاخستان دا.

جـالێرەدا پرسـیارێ سـەرهەڵدەدا ئایـا چـی ڕوودەدات ئەگـەر کاروبـاری ڕوسـیا بـەرەو خـراپترو لاوازتـر بـڕوات، ئایـا سیسـتەمی چاودێری کردنی ئەم عەمبارانە بەشێوەیەکی وورد بەڕێوە دەچێ، ئایا ڕوسـیا نیـازی نابێـت بەهەنـدێ وڵاتـی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت چـەکی نەوەوی بفرۆشێ، ئایا ئەورووپای ڕۆژئـاوا لەگـەڵ ئـەو هـەموو قەیرانـەی کەبـەرەو ڕووی بۆتـەوە چـی تـر دەتـوانن یارمـەتی ڕوسـیا بـدەن تـاکو بەرەو دیموکراتیەتو بازاڕی ئازادی بەرن؟ ئەمانە هەمووی پێش بینی دەکرێت.

گـەورەترین پرۆسـەی فەسـادو موخـەددەرات ئـەنجام دەدرێـت، بڵاوبوونەوەی دیاردەی مافیا کە یلتسن بەچوارهەزار گرووپی ناودەبات

نزیکەی سێ سەدو سی دزیو تالآن کردن لەمانگێکدا ئەنجام دەدرێت.

جوانی سروشت پشتگوێ خراوە، ئەمڕۆ شتێکی ئاسان نیە بایەخ بەم لایەنە بدرێت، چونکە لەڕووی تەکنیکیو داراییەوە کۆمەڵێ ئاستەنگیان بۆ دروست دەکات بەم شێوەیە دوای حەفتا ساڵی ڕوخانی ئابووری، ئابورییەکی باشتر جێی نەگرتۆتەوە، کەزۆربەی خەڵکی سودی لێ وەربگرن ئەنجامەکەشی شەڕو ئاژاوە چێ دەبێت، بەهەزارەها بەرەو ڕۆژهەڵات و ولاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا کۆچ دەکەن بەمەش ئاسایشی ناوچەکە دەکەوێتە مەترسییەوە.

## ئەنجامەکەی:-

هەرەسهێنانی سۆشیالیزم و بیروباوەڕی مارکسی- لینینی لە بیرۆکراتیەتو پەرستنی دەق لەسەر حسابی ژیان بوو ئەگینا مارکسیەت، فەلسەفەیەکی زانستیە، پێش دەکەوێت لەگەڵ پێش کەوتنی زانستو زانیاریو تەکنۆلۆژیا، بیروباوەڕێکی وشك نیە، نابێ دەقی مارکسی لە ئێستاو داهاتوودا وەکو خۆی جێبەجێ بکرێت بەڵکو دەبێت گۆڕانو لابردنی لەسەر پەیڕەو بکرێت، بۆیە بەهەڵە دەچن ئەو کەسانەی وابزانن کەمارکسیەت هەرەسی هێناوە، گارۆدی لەکتێبەکەیدا بەناوی (کورتە مێژوویەکی سۆڤیەتی) هێرشێکی توند دەکاتە سەر یلتسنو گۆرباتشۆف بەخائن و خۆفرۆشی سەرمایەدارییان لەقەڵەم دەداتو دەڵێت:- ئەوەی ڕوویدا لەسۆڤیەت شکستی مارکسیەت نەبوو، بەڵکو کاریکاتۆری مارکسیەت نوشوستی هێنا، چونکە گۆرباتشۆفو خرۆشۆف مارکسیەتیان جێبەجێ نەکرد، بەڵکو گۆڕیان بۆ سۆشیالیزم هەڵکەند، گرنگی مارکسیەت تەنیا لە فەلسەفەکەی بەدیار ناکەوێت، بەڵکو لایەنی تر دەگرێتەوە وەکو

پڕۆگرامێك بۆ لێكۆڵینەوەی سوسیۆلۆجی و مێژوویی ئەمە لەلایەك، لەلایەكی ترەوە بایەخدان بە بیری ماركسی تەنیا لەلایەن ئەو كەسانەوە ئەنجام نادرێ كە هەڵگری بیرەكەن، بەڵكو زاناو ڕۆشنبیری تریش بەخۆوە دەگرێت كە سەردەمێ پەیوەندیان بەبیری بورجوازییەوە هەبووە، یاخود هەواداری ماركسیەتن، یان ئەو كەسانەی گیانێكی ڕووناك وەبەر فەلسەفەی ماركسی- لینینی دەنێن بەمەش ڕەگ و ڕیشەی دەچەسپێ و دەبێتە بیرێكی نەمرو ڕەسەنی دوارۆژی گەش و زیندوو. ئەم زانایانە پەیڕەوی ئەوە ناكەن ماركس چی ووتووە یاخود چی نووسیوە بەڵكو خۆیان بەبیری ڕەسەنی ماركسیەت دەبەستنەوە بەتایبەتی مادییەی مێژوویی و چینایەتی و چۆنیەتی بەكارهێنانی بۆ لێتۆژینەوەی سیستەمی سەرمایەداری. لەكتێبی ڕوسیا دوای (٢٠١٠)دا دوو سیناریۆی دەستنیشان كردووە بۆ دوا ڕۆژی كۆمۆنیزم. سیناریۆی یەكەم دوو باڵی هەیە، لەلایەنی یەكەم ئاژاوەو گێرمەو كێشە ڕوو لەزیاد بوون دەكەن، بەرامبەر بەمەش لەوانەیە ڕێككەوتن لەنێوان كۆمۆنیستەكان و هێزی سەربازی پێك بێت باڵی دووەم لەوانەیە دیكتاتۆریەكی نوێ بێتە كایەوە. سیناریۆی دووەم دەڵێت:- ڕوسیا كەرەسەیەكی ئابووری زۆری هەیە لەگەڵ چینێكی تەكنیكی و فەنی بەتوانا، لەبەر ئەوە باوەڕ ناكرێت بەرەو دیكتاتۆریەت بڕوات، بەڵكو ڕوسیا بەرەو سەرمایەداری لەسەر ڕێگای ڕووسی دەڕوات، كەسیستەمێكی بازاڕی هاوبەش لەڕژێمی كۆن و ڕژێمی بازاڕی ڕۆژئاوا لەگەڵ ڕژێمێكی فرە حیزبی لە كۆمۆنیزم و لیبرالیەكان لەژێر سایەی سۆشیالیستی پێك دەهێنن. كەلەپووری كۆمۆنیزم و یەكێتی سۆڤیەت كەلەپورێكی بەهێزە هەرچەندە چواردە كۆماری تر سەربەخۆییان وەرگرتووە، لەگەڵ

ئەوەشـدا، پەیوەندییـەکی رۆشـنبیری و ئابوورییـان لەگـەڵ ڕوسـیادا هەیـە. بۆیەمەزنـدە دەکرێـت کـەجارێکی تـر روسـیا وەك زلهێزێك بێتـە مەیدانەوە.

لـەرۆژی ٢٦ی حوزیرانـدا هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی روسـیا ئـەنجام دەدرێـت یەکـەم کاندیـدات (بـۆریس یلتسـن)ە کاندیـداتی دووەم (زیگـانۆڤ)ە بـۆریس یلتسـن لەلایـەن ئـەمریکاو فەرەنسـاو بـەریتانیاو ئەڵمانیا پشتگیریو هاریکاری دەکرێـت، بۆ ئـەم مەبەسـتە بەڕێوەبـەری سندوقی نێودەوڵەتی (میشال کامدیسو) ڕایگەیانـد کە ئـەم ڕێکخـراوە ئامادەیە (٩)ملیار دۆلار بەقەرز بە ڕوسـیا بدات ئەگـەر بۆریس یلتسـن زۆرینـەی دەنگـی وە دەسـت هێنـا، ئـەگینا ئـەوا چـاو بەبڕیارەکـە دەخشـێندرێتەوە، کاندیـداتی دووەم کەسـکرتێری حیزبـی شـیوعی‌یە(گینـادی زیگـانۆف)ە، لـەکۆنگرەی حیزبەکەیـدا رایگەیانـد ئەگەر سەرکەوتنی وەدەست هێنا لەم هەڵبژاردنەدا ئەوا حکومـەتێکی ئیـتلاف پێکـدەهێنێت بـۆ ئـەم مەبەسـتەش حیزبـی جووتیـاران، سـەرکردەی نەتـەوەیی تونـدڕەوەکان فلادمـیر جیرنۆفیسـکیو کۆمۆنیسـتە تونـدرەوەکان، ریفـۆرم سـازی ئۆپۆزیسـۆنی (کریگـۆری ئیفلینسـکی)، ژەنـەڕاڵی نەتـەوەیی ئەسـکەندەر لێبـدو پشـتیوانی لێدەکـەن، دیـارە حیزبـی کۆمۆنیسـت هیـوای سـەرکەوتنی گـەلێ زۆرە، چـونکە بارەکـە لەبەرژەوەنـدی کۆمۆنیسـتەکانە، خـراپ بـوونی بـاری ئـابووری لەلایـەك، لەلایـەکی تـرەوە ئـەوبارە نائاسـاییەی کـە (بـۆریس یلتسـن) بەسـەر روسـیای سـەپاندووە، لـەجیاتی دیمـوکراتی کوشـتنو بڕینو تۆقانـدنی پـەیڕەوکردووە، بەتایبـەتی وەزیـری بـەرگری (پاڤیل گراتچـۆڤ)و دامودەزگاکـەی دەسـتێکی خراپیـان هـەبوو لـە بۆردومـان کردنـی پەرلـەمانو هێـرش کردنـە سـەر چیچـانیەکان، بۆیـە زۆربـەی

خەڵكی لە بۆریس یلتسن و وڵاتە غەربییەكان بێ هیواو بێ زارن و بەهەموو شێوەیەك پشتگیری زیگانۆڤ دەكەن (زیگانۆف) پێش هەموو شتێك بیر لەچاك كردنی باری ئابووری كردۆتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش كۆمۆنیستەكان هەوڵدەدەن.

- دامودەزگاو پرۆژەو كارگە گەورەكان خۆماڵی بكرێنەوە و ببنەوە موڵكی دەوڵەت.

- هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارو بەڵگەنامانەی كەلە ساڵی ١٩٩٠دا سەبارەت بەدەستووری وڵات گۆڕانكاری بەسەردا بكرێت.

- سەركردەی دەوڵەت لابرێت.

- ئەنجومەنی سۆڤیتات بگەڕێنرێتەوە.

- بازرگانی و بانكەكان بكرێنەوە، بە موڵكی گەل.

- ئەو بارە گرژی و نائارامیەی كەلەهەندێ وڵاتی جیران كەتاكو دوێنێ بەشێك بوون لە سۆڤیەت بەتایبەتی بالتیكان وا لە ڕوسیا دەكات كە ڕاڕابێت و لەگەڵیدا بكەوێتە زۆرانبازی و دەسەڵاتی خۆی جارێكی تر بەسەریان بسەپێنێتەوە.

- لەدەست دانی ناسنامەو ڕێزی جارانی و دابەزینی ئاستی ژیان و گوزەرانی خەڵك بارێكی دەروونی وای خولقاندووە كەتەنانەت نەتەوە پەرستەكانیش بیربكەنەوە بۆ ئەوەی هەیبەتی جارانیان بگەڕێتەوە.

**سەرچاوەكان**


1- Daniel Yergin and Thanc gustafson: Russia 2010, 1995.

2- Bernard feron: la Rrssie- Espoirs et Dangers, Paris, 1995.

3- Roger Garudy: Souviers- toi breve Histoire de Lunion sovitique, 1995.

٤- مجلة الطريق، العدد (٣) بيروت، ١٩٩٦.

٥- مجلة الطريق، العدد (٤)، بيروت، ١٩٩٦.

# بەربەرەکان
# گەلی ڕەسەنی باکووری ئەفریقان

## پێشەکی :-

ئەم باسەمان کەلەسەر (بەربەرەکان)ە، بۆ کۆتایی سالانی نەوەتەکان دەگەڕێتەوە، کەئەوکات باسکاری خوێندنی بالابووم لەزانکۆی پاریسدا، لەبەشی ناوخۆدا بەربەرەکانم ناسی، بەهۆی هاوڕێ سەعیدی بەربەرەوە کەئەویش خەریکی خوێندنی بالابوو، زانیارییەکی باشم لەسەر بەربەرەکان لەلا گەڵاڵەبوو، جگە لەبلاوکراوەی بەربەرەکان کەبەزمانی فەڕەنسی بۆی دەهێنام، هەر ئەوکات لەو خەیاڵەدابووم کە هەلێکم بۆ هەڵکەوێ شتێ دەربارەی هاوڕێکانم بنووسم، بەهیوام توانیبێتم شتێ لەسەر کەلەپوورو خەباتی ئەم گەلە بخەمە ڕوو، دیارە بەربەرەکان لە پاریس دوو شەپۆڵ بوون، لەگەڵ هەردوو شەپۆلیشدا ئاشنایەتیم هەبوو، شەپۆلی فرانکۆفۆنی کەدەسکەوتنی باش بەدەست دەهێنا، شەپۆلی دووەم کە ڕێبازێکی ئاینی هەبوو، بەداخەوە ئەم شەپۆلە هەستی نەتەوایەتییان زۆر بێ هێزبوو لایەنی ئاینی بەسەریدا زاڵ بوو.

ئەمڕۆ نزیکەی (٢٣٠) دووسەدو سی کەمە نەتەوەیی لەجیهاندا بوونیان هەیە، ژمارەی کەمەنەتەوەییەکان لەئەورووپای ڕۆژئاوا و یابان دەگاتە (٢٤) کەمە نەتەوەیی و ژمارەی دانیشتووانیان نزیکەی (٣٨)ملیۆنە، لەئەورووپای ڕۆژهەلات و روسیا (٣٢) کەمە نەتەوەیی

هەنە، ژمارەی دانیشتوانیان دەگاتە (١٥٣) ملیۆن، لەئاسیای (٤٣) کەمە نەتەوەیی هەنەو ژمارەی دانیشتوانیان دەگاتە (٢٣٧)ملیۆن، لەئەفریقاو رۆژهەلاتی ناوەڕاست (٣١)کەمە نەتەوەیی هەنە، دانیشتوانیان نزیکەی (١١٨) ملیۆنە لە ئەمریکای لاتینی (٢٩) کەمە نەتەوەیی بوونیان هەیە، ژمارەی دانیشتوانیان دەگاتە (٤٩) ملیۆن لە ئەفریقاو خوارووی بیابان، نزیکەی (٧٤) کەمە نەتەوەیی هەنە، دانیشتوانیان (٢٣٠) ملیۆن دەبن[١].

لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، کوردو فەلەستینیەکان لەخەباتی بەردەوام دان لەپێناوی مافەڕەواکانیاندا، لەسەرووی ئەفریقاش بەربەرەکان رێگایەکی ترسناکیان گرتۆتەبەر، قەبیلەکان، (بەربەرەکان) دانیشتووی بنچینەیی سەرووی ئەفریقان (لەناوەراستی سەدەی حەڤدەهەمەوە شەپۆلێکی عەرەب بۆناوچەکە کۆچیان کرد، کەلتوری ئاینی ئیسلامیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، بەربەرەکان پارێزگاری خووڕەوشت و سیمای تایبەتی سەرووی ئەفریقایان کرد، ژیانی لادێیان هەروەکو خۆی مایەوە هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهات، بەلاّم ژیانی شارییان، بەقولی کاریگەری پێوە دیاربوو[٢].

بەم جۆرە زمانو یاسای عەشایەریو ئەدەبی فۆلکلۆرییان بەهۆی دابونەریتی عەرەبەوە وەرچەرخانی بەخۆوە بینی، بەربەرە گوندنشینەکان دانیان بە حکومەتی ناوەندی نەناو ڕەتی ئەوەیان کردەوە، کەباجو سەرانە بەمیری بدەن.

کاتێ فەرەنسا لەساڵی ١٨٣٩دا جەزائیری داگیرکرد، دانی بەوەنا کەجیاوازی بەرچاو ودیار لەنێوان عەرەبەکانو بەربەرەکاندا دەبینرێن بۆئەوەش دوو سیستەمی جوداوازی بەڕێوەبردنی پەیڕەوکرد، هانی دەربڕینی کەلتورو زمانی بەربەریداو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە

گەلێ لەبەربەرەکان بۆکار پەیداکردن بەرەو فەرەنسا بچن، بەشێکی گەورەی بەربەرەکان لەمەغریب دەژین، نزیکەی شەش ملیۆن دەبن، بەرێژەی ٤٠٪ی مەغریبین، ژمارەی دانیشتوانی مەغریب (٢٠)ملیۆنە، فەرەنسا زۆر بایەخی بەزمانو رۆشنبیری بەربەردا، پاش سەربەخۆیی بوونی مەغریب، بەشێك لەبەربەرەکان کران بە پۆلیسو سەرباز، بەشێکی زۆری لەحکومەتی ناوەندی دوورکەوتنەوە، دانیشتوانی جەزائیر (٢٤)ملیۆنە، نزیکەی (٥ – ٦) ملیۆنی بەربەرەکە رێژەی ٢٥٪دەبێ. کاتێ جەزائیر لەلایەن فەرەنسیەکانەوە داگیرکرا، فەرەنسیەکان زیاد لەپێویست گرنگیان بەزمانو رۆشنبیری بەربەردا، بەلام پاش سەربەخۆیی جەزائیر لە ١٩٦٢دا، بەتەنیا هەر زمانی عەرەبی زمانی رەسمی جەزائیر بوو.

محمد مختار العرباوی لەکتێبەکەیدا ((في مواجهة النزعة البربرية وأخطارها الانقسامية)). روونی دەکاتەوە کەریشەو بنەچەی بەربەرەکان عەرەبەو ووشەی بەربەر ووشەیەکی عەرەبییەو هیچ پەیوەندی بە ووشەی (قارقاراس)ی یۆنانیو ووشەی (باربادرس)ی لاتینییەوە نیە، بەڵکو سروشتێکی بیانی هەیە، پاشان لەقسەکانیدا بەردەوام دەبێو دەڵێ: نووسینو پیتەکانی بەربەر نموونەیەکن لەنموونەی نووسینی عەرەبی کۆن، خودی بەربەرەکانیش عەرەبی کۆنن، بەقۆناغی جیاجیادا بۆناوچەکە هاتوون[٣] محمد مختار لە لێکۆلینەوەکەیدا پشتی بەهەندێ سەرچاوەی نا زانستی بەستووە، بەمەش دەیەوێ راستیەکان بشێوێنێ واقعی راستەقینەی بەربەرەکان تێکوپێك بدات، لەکۆتایی باسەکەیدا دەڵێ:– ((فەرەنسا پاش داگیرکردنی وڵاتی مەغریب گیانی جوداخوازی تێداچاند، ئەمەش بوو بەهۆی ورووژاندنی گیانی ناتەبایيو تێکدانی وڵات بەتایبەتی

لەنێوان بەربەرەکانی فرنکۆفونی سەر بەفەڕەنسا و ئەوروپای ڕۆژئاوادا،[٤] قسەکانی لەقسەی عەرەبێکی ڕەگەز پەرست دەچێ هەمان ئەو ڕەگەز پەرستانەمان دێنێتەوە یاد کە دەیان ووت کوردەکان داردەستی ئیمپریالیزمن بۆتێکدانی یەکێتی عێراق هاندراون.

## زمان و شیعری بەربەری:-

زمانی قەبیلەکان (le kabylie) واتە بەربەرەکان تووشی هەڵچوون و داچوون بووە، زمانەکەیان لەلایەك کەوتۆتە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبی، لەلایەکی ترەوە کەوتۆتە ژێر گاریگەری زمانی فەڕەنسی بەتایبەتی لەکاتی داگیرکردنی سەرووی ئەفریقا لەلایەن فەرەنسیەکانەوە، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کەبەشێك لەبەربەرەکان گوندەکانی خۆیان بەجێبهێڵن و ڕووبکەنە شارەکان، کاریگەری زمانی ئەمازیغی بەسەر زمانی عەرەبییەوە شوێنەواری دیارە، هەروەك زمانی عەرەبی کاریگەری بەسەر زمانی ئەمازیغیەوەیە.

((دەقەکانی بەربەرکۆنن، نەقشکراون بۆ ساتێکی ئێجگار کۆن دەگەڕێنەوە، نزیکن لەزمانی هیرۆگلیفی، بەڵام پیتەکانیان نەدۆزراونەتەوە و ڕێك نەخراون، بۆیە گواستنەوەی ئەم دەقانە کارێکی گەلەك گرانە))[٥].

جگە لەو نەقشانە هەندێ پیتی تریان لەنووسینی زمانەکەیاندا بەکارهێناوە، هەروەها دەقیشیان هەیە کەبەپیتی لاتینی نووسراون،زمانی عەرەبیشیان بەکاربردووە. بەربەرەکان خاوەن سامانێکی فۆلکلۆری فرە دەوڵەمەندن ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە لەزەنگین کردنی ئەدەبی جەزائیریدا. بۆیە (ئیڤی لاکۆست) دەڵێ:-

((ئەگەر ڕۆشنبیرییەك لەجەزائیر هەبێت، ئەوا بێشك ڕۆشنبیری تەقلیدی بەربەرەکانە))[٦] بەم جۆرە گەلی جەزائیری خاوەنی ئەدەبێکی

گەلی‌یە کە بەزمانی بەربەری نووسراوە، زۆر لەرۆژهەلاتناسە فەرەنسیەکان بایەخیان پێداون و کۆیان کردوونەتەوە وبۆسەر زمانی فەرەنسیان وەرگێڕاون. سی موهاند(si mohand) یەکێکە لەگەورەترین شاعیرانی شەعبی بەربەر، شاعیر لەشیعرەکانیدا واقیعی بەربەرەکان بەخۆشی و ناخۆشی دەخاتە ڕوو، زۆر لایەنی دەروونی بەربەرەکانی خستۆتە پێش چاوان، بابەتەکانی شیعری بەربەری دڵداری، برایەتی، دوورە وولاتی، نیشتمانین...هتد.

((کۆمەڵە شیعرێکی بەربەری بۆسەر زمانی فەرەنسی وەرگێردراون بەناوی (لەچیاو دۆڵەکانەوە) کە هەوڵێکە بۆ ناساندنی شیعری بەربەری بەخوێنەری فەرەنسی زان))[٧] هەروەها کۆمەڵێکی تریش لەشیعری بەربەری لەلایەن (جۆن ئەمرۆش Jean Amrouche)ەوە بۆسەر زمانی فەرەنسی وەرگێردراون))[٨] شیعری بەربەری ئاوێنەی ژیانی پێشوو و هاوچەرخانەیە، شیعرەکە پڕە لەجوانی و سیحرو سۆزو ڕاستی و ڕاستگۆیی. بەزمانێکی ساکارو سادە ژیانێکی رۆژانەیان دەردەبڕی باسی ریالیستی لادیکانیان دەکات کەپڕە لەهەستی مرۆڤایەتی. جگە لەشیعر بەزمانی ئەمازیغی چیرۆك و حیکایەت و پەندو حیکمەتی زۆر نوسراون بەشێکی چیرۆکەکان لەسەرزاری ئاژەڵن. لەناو بەربەرەکاندا گەلێ ڕۆناکبیرو ئەدیبی ناودار هەڵکەوتوون وەکو کاتب یاسین، محمد ئارکۆن، ئیبن خەلدوون...هتد.

بەش بەحاڵی خۆم ساڵی ١٩٨٧، لەگازینۆیەکی بەربەرەکاندا لەپاریس چاوم بەشاعیرو ڕۆمانووسی بەربەرەکان کاتب یاسین کەوت دوای گفتوگۆیەکی زۆری ئەدەبی، پشتگیری خۆی بۆ خەباتی ڕەوای گەلەکەمان دەربڕی.

## بەربەرەکان کێن:-

توێژەرەوەکان لەسەر بنەچەی بەربەرو لەهجە جیاجیاکانیەوە بۆ چوونی جودا وازیان هەنە، هەندێکیان دەڵێن بەربەرەکان ئاری لاتینین، ناحەزەکانیان دەڵێن بەربەرەکان عەرەبی قەحطانینو لە ئەلحەمرین نزیکن، پاشان دەڵێن بەربەرەکان زمانیان نی یە، بەڵکو خاوەنی چەند دیاڵیکتیکی جۆراوجۆرن، تاکە کتێبێك چی یە بەزمانی بەربەری نەنووسراوەتەوە، هەندێکی تر دەڵێن ووشەی بەربەر بنەچەیەکی عەرەبی هەیە، بەربەرەکان ئەمڕۆ بەخۆیان دەڵێن ئەمازیغ، زمانی ئەمازیغی لەناو تیرەو هۆزەکانی مەغریبو جەزائیر و تونسو مۆریتانیا و مالی و نێجیریا و لیبیاو سیوای رۆژئاوای میسر بەکاردێن. بەربەرەکان لە مەغریب بەسێ دیاڵیکتیك قسەدەکەن (تریفیت، شلحبت، تمزیغت).

## داواکانی بەربەرەکان:-

بەربەرەکان لەخەباتو تێکۆشاندان بۆ دەست خستنی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:-

١- بۆ ناسنامەی بەربەری ڕەتی ئەوە دەکەنەوە کەلەچوارچێوەی عەرەبیو ئیسلامی بتوێندرێنەوە.

٢ - رەتکردنەوەی دیاردەی تەعریب کەپاش سەربەخۆیی بوونی وولات، هەموو قۆناغەکانی خوێندنی گرتۆتەوە، دوو شەپۆلی ناکۆك لە بزوتنەوەی بەربەرەکاندا بەرچاو دەکەون، شەپۆلی یەکەم، شەپۆلێکی هەڵبژاردەن گەرەکیانە بزوتنەوەکەیان بەبواری رۆشنبیری فرانکۆفۆنی پەیوەستداربکەنو زمانی ئەمازیغی بە ئەلفو بێی لاتینی بنووسن، شەپۆلی دووەم کەشەپۆلێکی گەلی یە، دەیانەوێ

بزوتنەوەکەیان بە ڕەوڕەوەی رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامی ببەستنەوەو زمـانی ئـەمازیغی بـەکار نـەهێنن، لـەجیاتی ئـەلف‌وبێی عـەرەبی بەکاربهێنن. لێکۆڵەرەوەکان دوو جۆرن، یەکەمیان دەڵێن، بەربەرەکان رەگەزێکن لەرەگەزەکانی مێژووی سەرووی ئەفریقا، بێ ئەوەی زمانی ئـەمازیغی وەکـو ئالایـەك دژ بەعەرەبـەکان بەرزبکەنـەوە، بـەلام لێتـوێژەرەوەی تـر بەتایبـەتی فەرەنسـیەکان دەڵـێن، بەربـەرەکان لـە بنچینەی جەرمەنی و رۆمانین و زمانی بەربەری هیچ پەیوەندی بەزمانی عەرەبییەوە نی‌یە، رایەکی تریش هەیە لە لێتوێژەرەوە عەرەبە تەسك بینەکان کەلەسەر ئەوەی کۆکن کە فەرەنسیەکان کاتێ ناوچەیەکەیان داگیرکـرد هەوڵیانـدا کەیـەکێتی نیشـتمانی لـەنێوان عەرەبـەکان و بەربەرەکاندا تێك بدەن و گیانی ناتەبایی و دووبەرەکیان بلاوکردەوە، لەساڵی ١٩١٣دا یەکەم کورسیان بۆ زمانی ئەمازیغی لە ربات دروست کـرد، بەدامەزرانـدنی قوتابخانـە بـۆ زمـانی عـەرەبی و لەهجـەکانی بەربەرەوە، پاشان بەردەوام بوون لەسەر بایەخدان بەزمانی بەربەری سـاڵی ١٩١٥ ئامۆژگـای لێکۆڵینـەوەی بەربـەریان چێکرد، گۆڤـارێکی تایبـەتی بەربـەریان دەرکـرد، وەلەسـاڵی ١٩٢٩دا قوتابخانەیـەکیان بـۆ فێرکردنی دیالێکتەکانی بەربەری لە ربات دروست کرد، پاشان گۆڕا بە ئەنستیتووی لێکۆڵینەوەی بالا... رەخنەگرانی شەپۆلی ئەمازیغی دەڵـێن:- فەرەنسـا هانـدەرێك بـوو، بۆئـەوەی گیروگرفـت و بەربەسـت بەرامبـەر زمـانی عـەرەبی و بـەرەنگاری پێشـکەوتنی زمـانی عـەرەبی بێتـەوە. بەم جۆرە فەرەنسیەکان ساڵی ١٩٦٧ ئەکادیمیای بەربەریان لـەپاریس چـێکرد، بۆئـەوەی گرنگـی زمـانی فەرەنسـی لەمـەغریب و جـەزائیروتونس و مۆریتانیـا هـەر زاڵ بـێ، هـەروەها بـەدەیان لاویـان لـــەکاروباری ئیداریـــدا دامەزرانـــد تـــاکو لـــەکاتی ســـەفەرکردنی

فەرەنسیەکاندا جێگایان بگرنەوە. بەم جۆرە کەشوهەوایەکی وایان خولقاندو بزوتنەوەی رۆشنبیری بەشێوەیەك لەناو بەربەرەکاندا پەرەی سەند، کەئالآیان بەرزدەکردەوەو دەیانووت، ئێمە عەرەب نین و ئەمازیغی زمانی نەتەوەیی دووەمە لەووڵاتدا، لەکۆتایی ئازاری ۱۹۹٦ کۆمەڵەی ئەمازیغی مەغریبی جڤینێکی هاوبەشیان بەست، بەمەبەستی دانانی هێڵی گشتی و ستراتیجیەتی قۆناغی داهاتوویان دەست نیشان کرد، داواکاریەکانی ئەمازیغیەکانیان لەزمان و رۆشنبیریدا خستە ڕوو، ئەم شانزە کۆمەڵەیە، کە کۆمەڵەی رۆشنبیری بوون لەکانوونی دووەمی ۱۹۹٦ دا لەڕبات، لەژێر چاودێری ئەنجومەنی نیشتمانی کۆبوونەوەیەکیان بەست، بەسەرۆکایەتی پارێزەر (ئەحمەد ئالدغرنی) کەبەتوندی ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر دەسەلآتی ناوخۆیی دەربڕی کەهیچ هەنگاوێك بۆ خوێندنی زمانی ئەمازیغی نەهاوێشتراوە، هەروەها دەستەلآتی ناوخۆیان ڕیسواکرد کەدژی کۆبوونەوەو سەربەستی ڕادەربڕین دەوەستێ، داویان کردکە یاسای ئەمازیغی بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە بایەخی پێبدرێت و دانی پێدابنرێت.(ئەمازیغیەکان هەڵگری ڕەگەزنامەی جوداوازن و ئەندامی کۆنگرەی ئەمازیغی جیهانین، نامەیەکیان ئاراستەی مەلیکی مەغریب، مەلیك حەسەنی دووەم کرد، داوای ئەوەیان کرد کەزمانی ئەمازیغی بەڕەسمی بکرێت و هەروەها ئەنجومەنی نیشتمانی بۆیەکخستن کەلە هەژدە کۆمەڵەی ئەمازیغی پێکهاتبوو لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا کەلەحوزەیرانی هەمان ساڵ بەسترا، جەختیان لەسەرئەوە کرد کەپێویستە دەقی یاسایی بۆ دیاڵیکتەکانی ئەمازیغی پیادە بکرێت، دان بەزمان و کەلتووری ئەمازیغی مەغریبی بنرێت واز لەسیاسەتی

تواندنەوەی بەربەرەکان لەنێوچوارچێوەی کۆمەڵی عەرەبی ئیسلامی بهێنرێت.[٩].

ووتیان ئەگەر میری گوێڕایەڵی داواکانمان نەبێت، ئەوا ناچاردەبین فشار بخەینە سەر حکومەت.

(( محەمەد شەفیق) کەتوێژەرو ئەکادیمیەکی مەغریبیی‌یە، خاوەنی پڕۆژەی فەرهەنگی عەرەبی – ئەمازیغی‌یە، وەرەقەی ئەمازیغی وەکو وەرەقەیەکی سیاسی وروژاند کەبە هۆیەوە مەغریب بتوانێ هەموو سەرووی ئەفریقا بۆلای خۆی ڕابکێشێ، ڕەنگدانەوەی لەو کەسانە دەبێ کە بەئەمازیغی دەدوێن لەمالی، نێجیریا، مۆریتانیا، لیبیا، تونس و ڕۆژئاوای میسر، بەڵام لەجەزائیردا کێشەی ئەمازیغی قەدەغە کراو نی‌یە، دوای ئەوەی ڕێگا بەخوێندنی ئەمازیغی و تەلەفزیۆن دراوە،[١٠].

## حیزبەکانی بەربەر:-

لەپاش سەربەخۆیی مەغریب، یەکەم حیزبی بەربەری لەمەغریب ساڵی ١٩٥٩ دروست بوو، دامەزرێنەری ئەم حیزبە ئەفسەرێکی سەرباز بوو بەناوی (المحجوبي احرضان)و د.عبدالکريم الخەتیب کەهەردووکیان لەحکومەتە جیاجیاکاندا پۆستی وەزارییان هەبووە، بۆ ئەوەی نوێنەری دانیشتووی ئەمازیغی بن لەدەزگاکانی دەوڵەتدا.

ئەمڕۆ لەمەغریب دا چوار حیزبی ئەمازیغی هەن، کەسێ حیزبیان لەپەرلەماندا نوێنەریان هەن، وەکو حیزبی (بزوتنەوەی گەلی بەسەرۆکایەتی (محند العنصر)، بزوتنەوەی نیشتمانی گەلی بەسەرۆکایەتی (المحجوبي احرضان)، بزوتنەوەی گەلی دیموکراسی بەسەرۆکایەتی (محمود عرشان)، لەدەرەوەی پەرلەمانیش بزوتنەوەی

گەلی دیموکراسی بەسەرۆکایەتی (د. الخەتیب) کە ڕێبازێکی ئیسلامی هەیە.

## چالاکی بەربەرەکان ڕووی لەزیاد بوون کرد.:-

کۆمەڵەی مەغریبی بۆ لێکۆڵینەوەو ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری کە ساڵی ١٩٦٧ لەمەغریب دامەزرا، داواکاریەکانی بەربەری لەئامێز گرت، دەستی کرد بە بلاوکردنەوەو دەرخستنی تایبەتمەندی ڕۆشنبیری و زمانەوانی ئەمازیغی و هاندانی ڕۆشنبیری کەبەو زمانە داهێنان و ئەفراندن بکەن. ڕووداوەکانی شاری تیزی و دەوربەری جەزائیر لە(٢٠)ی نیسانی ١٩٨٠دا بەبەهاری ئەمازیغی ناسراوە، کەبەمێژووی لەدایك بوونی بزوتنەوەی سیاسی بەربەرلەسەرووی ئەفریقا دادەنرێ، پاشان کۆنگرەی باکوور بەسترا کەلە بناغەو چالاکیەکانی بزوتنەوەکەی جێگیرکرد، لەئامانجەکانی ئەم بزوتنەوەیە، زمانی بەربەری لەئاستی زمانی عەرەبی بێت. (لەساڵی ١٩٨٠دا زانکۆی هاوینی لەشاری ئەغادیری مەغەریبیدا، کۆمەڵێ کۆڕو سیمیناری لەسەر ڕۆشنبیری ئەمازیغی بەست، لەساڵی ١٩٩٣دا یاداشت نامەیەك لەکۆمەڵەی ئەمازیغیەوە بۆ کۆنگرەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لە ڤێنا نێردرا)). [11]

لەهەمان ساڵدا میهرەجانێکی ئەمازیغی لەشاری ئەغادیرو هەروەها میهرەجانێك لەشاری دوارنویە لەناوچەی بریتۆنی فەڕەنسی کرا.

زیاتر لەسێ کۆمەڵەی ئەمازیغی بەشداری تێداکردو بەیانێکیان دەرکردو تێیدا پرۆژەی کۆنگرەی جیهانی ئەمازیغییان خستە ڕوو کەجەخت لەسەر شوناسنامەی هاوبەشی بەربەرەکان دەکات، هەروەها بەیاننامەکە جەخت لەسەر پارێزگاری کردنی مافەکانیان دەکات،

کەمێژووی ئەم گەلە شێوێندراوەو بە زۆر ڕێگا سەرکووت کراون، جگە لە کۆمەڵێ ئامانج و ستراتیجیەتی تێدا خراونەتە ڕوو، کەهەندێکیان لەڕووی سیاسییەوە بوو، هەندێکی تریان بۆ چاوەدێری نێونەتەوەیی و پشتگیری کردنی خەباتەکەیان بەشێوەیەکی ئاشتیانە لەکۆنگرەی ڤێنادا کەلەحوزیرانی ١٩٩٣ بەسترا کەدەربارەی مافەکانی مرۆڤ بوو، ئەمازیغیەکانی مەغریب لەئاستی نێونەتەوەیی بەدەرکەوتن، بۆیەکەم جار وەفدێکی رۆشنبیری ئەمازیغی بەشداری کۆنگرەیان کرد، کۆمەڵێ دۆکۆمێنت و بەڵگەنامەو کتێبی ئەمازیغی مەغریبی‌یان بەسەر وەفدی کۆمەڵەی مافی مرۆڤو کۆمەڵە نارەسمیەکانی مەغریب دابەشکرد، پاشان کارەکە پەرەی سەندو لەرۆژنامەی نیشتمانی جەزائیری لەهاوینی ١٩٩٣ نامەیەك بلاوکرایەوە بەتەوقیعی بەشداربووانی کۆنگرەی ڤێنا کەداوای بەستنی کۆنگرەی جیهانی ئەمازیغی دەکات، نامەکەش لەلایەن ئەمازیغیەکانەوە بەتایبەتی جەزائیرییەکان بەگەرمی پێشوازی لێکرا. بەڕاستی کۆنگرەی جیهانی بۆ ئەمازیغیەکان بەسترا کەئێستا بارەگاکەی لە لەندەنە، لێژنەی سەرپەرشتکاری ڕێکخستن بەردەوام لەکارو پەرەپێدانیدان لەکۆنگرەی پارێزەرانی عەرەب کەلە (دار البیضاء) لەمانگی ئایاری ١٩٩٣ بەسترا، پارێزەر حسن ئایاد قاسم کەیەکێك بوو لەچاپووکەکانی ئەمازیغی مەغریبی نامەیەکی دابەشکرد، کەداوای گۆڕینی دروشمی ڕاستی و عروبەی کرد، (لەپێناو ڕاستی و دیموکراسی)دا، هەروەها گۆڕینی ناوی یەکێتی پارێزەرانی عەرەبی بەیەکێتی پارێزەران لەجیهانی عەرەبییدا، چونکە زۆبەی پارێزەرانی مەغریب، جەزائیر، تونس و لیبیا ئەمازیغین، لەگەڵ بوونی

پارێزەر لەناو کەمە نەتەوەیی‌یە ناعەرەبەکاندا وەکو ئەرمەن‌و کورد لە عیراق و سوریاو فەلەستین، ئەقبات لەمیسر.

## کۆنگرەی جیهانی ئەمازیغیەکان:-

کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان لە١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٠دا بڕیارێکیان دەرکرد، کەساڵی ١٩٩٣ یان کرد بە ساڵی (دەولی بۆ گەلانی رەسەن) لاوانی گەلی سەر بەحیزبی بزوتنەوەی گەلی دیموکراتی کە ئوزین ئهحرضان سەرۆکایەتی دەکرد، یەکێکە لەکوڕانی سەرۆکی حیزب (المحجوبي احرضان) بەشداری کارو دیدەنیەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانی کرد، کەلەبارەی گەلانی رەسەنەوە بوو.

لە (٣,٢,١)ی ئەیلولی ١٩٩٥دا لەسەنتەری دەولی قەدیس (سان روم دیدولان) لەخوارووی فەرەنسا یەکەم کۆبوونەوەی جیهانی ئەمازیغی بەسترا، نزیکەی (٢٠٠) کەسایەتی بەشداری تێدا کرد کەنوێنەری پەیوەندی رۆشنبیری بەربەری مەغریب‌و جەزائیر و لیبیا و نێجیریاو نەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو فەرەنساو جزری کەناری‌و ئیسپانیاو ئەڵمانیاو بریتانیاو بەلجیکاو هۆڵەندا بوون. لەوانە (٢٠) مەغریبی‌و (١٠) کۆمەڵەی مەغریبی، ڕێکخراوی جیهانیان چێ‌کرد، لەژێرناوی (کۆنگرەی جیهانیی ئەمازیغی) نووسینگەیەکی فیدرالییان هەڵبژاد بەسەرۆکایەتی (مەبروك خرکال) کەلە (٢٢) نوێنەر پێکهاتبوو (١٠) مەغریبی، (٧) جەزائیری، (٢) لیبی، (٧) لەئاوارەکانی ئەوروپای رۆژئاواو نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ،(٢) لەجزری کەناری و (٢)لەخوارق. هەروەها نووسینگەیەکی دەولییان هەڵبژارد کە لە (١١) کەسایەتی پێکهاتبوو، پاریسیان کردە بارەگای سەرەکی ڕێکخراوەکە، رەزامەندیان لەسەر وەسیقەیەکدا بەناوی یاسای

بنچینەیی کۆنگرەی جیهانی ئەمازیغی گرنگترین مەبدەئو ڕێنمایی بزووتنەوەی ئەمازیغییان تێدا خستە بەرچاوان:-

١- واقعی بەربەری ئەمازیغی لەدەستەکانی دەولی نەتەوەکگرتووەکان، یۆنسکۆ و ڕێکخراوە ناحکومیەکان بخرێنە ڕوو.

٢- بەرگری لە ڕۆشنبیری ئەمازیغی بکرێت و پەرەی پێبدرێت و پێش بخرێت.

٣- هۆیەکانی دارایی بۆ بەجێگەیاندنی ئامانجەکانی مەیسەر بکرێت.

٤- خەبات لەپێناو ماف مرۆڤ، دیموکراسی، لێبوردن ئاشتی و ئازادی بەرقەراربێت.

ئەوشتانەی کەلەکۆنگرە دۆزرایەوەو خرانە ڕوو:-

١. مەغریب گەورەترین ژمارەی ئەمازیغی هەیە لەجیهاندا.

٢. ئەمازیغیەکانی جزری کەناری کەزۆرترین ژمارەیان لەپەرلەمان بەدەست هێنا، زمانی ئەمازیغییان لەپەرلەمانی (لاس بالماس)جێگیرکرد، بیر لەسەربەخۆیی و دروست کردنی دەوڵەتی ئەمازیغی لەجزری کەناری دەکەنەوە.

٣. ئەو ئەمازیغیانەی کە ناسنامەی فەڕەنسیان وەرگرتووە، ڕێژەیان دەگاتە دوو ملیۆن.

## هەڵوێستی حیزبەکانی مەغریب:-

ناتوانین هەموو حیزبەکانی مەغریب بخەینە یەك چارچێوە، بەلام بەشێوەیەکی گشتی هەڵوێستیان بەرامبەر ئەمازیغیەکان نائەرێیە، ئەمەش وایکردووە، کە بەربەرەکان تەعریب کردن بەتوندی ڕەت بکەنەوە.

فــراوان بــوونى بنــەماو بنچــينەكانى ئــەمازيغى، حيزبــەكانى ناچاركردوون كە ڕێگاى واقيعى بگرنـە بەر و هەڵوێسـتى نـەرم‌و نيـانى بنـوێنن. لاپـەڕەى ڕۆژنامـەكان بـۆ گفتوگـۆ بخرێنـە سەرپشـت بۆكـاتى هەڵبژاردن‌و سوود لێوەرگرتنيان بەكار بهێنرێن.

حيزبى سەربەخۆيى كەبيرو باوەڕێكى ئيسلامى كۆنـەخوازى هەيـە. مافـەكانى زمـان‌و ڕۆشـنبيرى ئـەمازيغى پشـتگوێ خسـتووەو دەڵـێ:- ئەمـە هەوڵێكـە بۆجوداخـوازى‌و تێكـدانى يـەكێتى نيشـتمانى، يـەكێك لەسەرۆكەكانى ئـەم حيزبـە كـەناوى (عبدالكريم غلاب)ولـە كتێبەكەيـدا (لەزمانـەوە بـۆ هـزر) دەڵـێ:- ئەوانـەى بايـەخ بەناسـنامەو ڕۆشـنبيرى ئــەمازيغى دەدەن، ئەوانــە زيندووكــەرەوەى ئــەو ڕق‌وكينەيــەن كــە ئيمپرياليزم لەووڵاتەكەمانـدا چاندى، بـەڵام حيزبـى ئيشـتراكى ڕاڕايـە لەبارەى كێشـەى ئەمازيغى‌يـەوە بەتايبـەتى لەئـەنجامى ئـەو هێـزەى كـە ئــەمازيغى لەكۆمەڵــدا پەيــدايكردووە، لــەكۆنگرەى پێنجــەمى ســاڵى ١٩٨٩دا بڕيارى هەمەڕەنگى ماڤ زمان‌و ڕۆشـنبيرى هەمەلايـەنى گـەلى مــەغريبى خســتە ڕوو، لــەكۆنگرەى لاوانيانــدا كەلــەكانوونى يەكــەمى ساڵى ١٩٩١دا بەسترا لە بڕوانامەى گيانيانـدا لاوانى يەكێتى‌و كێشـەى ئــەمازيغى بــوو، لەگــەڵ ئەوەشــدا هەنــدێ لەحيزبــەكان بەشــێوەيەكى نائــەرێى بــەرەنگارى كێشــەى ئــەمازيغى دەبنــەوە، بــەڵام حيزبــى پێشكەوتووو ئيشتراكى چونكە ئايدۆلۆجيـەتى ماركسـى هەڵـگرتووە، بەشــێوەيەكى ئــەرێى لەگــەڵ ئەمازيغيەكانــدا مامەڵــەى كــردووە، لــەكۆنگرەى يەكــەمى ســاڵى ١٩٧٥دا، ئامــاژەى بــەگيروگرفتى زمــان‌و ڕۆشـــنبيرى كـــردووە، هـــەروەها حيـــزب هەڵوێســـتى خـــۆى لەبڵاوكراوەكەيدا كەساڵى ١٩٨٠ دەرچووە، بەناوى (زمان‌و ڕۆشنبيرى ئەمازيغى بەشێكى نەپچڕاوى كەلەپوورى نيشتمانى مەغريبى‌يە بـەڵام

ڕێکخراوی کاری (دیموکراسی گەلی بەشێوەیەکی زۆر ووریا لەگەڵ ئەمازیغیەکان مامەڵە دەکات، چونکە سەرۆکەیان (محمد بن سعید) خەڵکی (سوس)ە کە بنکەی بزوتنەوەی بەربەری لێیە، ئەم ڕێکخراوە داوای پارێزگاری کەلەپووری نیشتمانی مەغریبی دەکات هەروەها بایەخ بە ڕۆشنبرییە جیاجیاکانی مەغریب بدرێت لەچوارچێوەیەکی تەسکدا، لەکتێبەکەیدا ڕەخنە لەداواکاریەکانی رۆشنبیری ئەمازیغی دەگرێت، کۆمەڵەی دادو چاکەخوازەکان کەسەرۆکەکەیان(عبدالسلام یاسین)ە هەڵوێستێکی سۆزاوی لەگەڵ شەپۆڵی بەربەردا هەیە. لەگەڵ بەشێك لەداواکاریەکاندا دەگونجێ، بەتایبەتی پاشگیرانی هەندێ لەچاپووکەکانی ئەمازیغی لەشاری (الراشدیە) لەخۆپیشاندانی یەکی ئایاری ساڵی ١٩٩٤دا، بەڵام بەگشتی ئیسلامیەکان دژی شەپۆلی بەربەرن، لە رونگەی ئەوەی ئیسلام ڕەتی جیاوازی ڕەگەزو ئاین و بنەچە دەکاتەوە.

## ئاسۆی دوا رۆژی ئەمازیغیەکان:-

لەئەنجامی ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانەی ئەمازیغی مەغریبی کەبایەخ بەزمان و رۆشنبیری ئەمازیغی دەدەن لەلایەك، لەلایەکی ترەوە بوونی ئەمازیغیەکان لەکۆمەڵێ ڕێکخراوی تری مەغریبی وەکو ڕێکخراوی یەکێتی نیشتمانی قوتابیانی مەغریب، کۆمەڵی مەغریبی بۆمافی مرۆڤ، یەکێتی نووسەرانی مەغریب، سەندیکای نیشتمانی بۆ پەروەردە، سەرەڕای بایەخدانی رۆژنامە نیشتمانیەکان پێیان، ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کەدەسەلاتدارانی ڕەسمی بە دوو شێوازی جودا مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، شێوازی قەدەغەکردنی راستەوخۆی ڕێکخراوەکان، شێوازی ناراستەوخۆ، وەکو بەرنامەی ئەمازیغی کەلە تەلەفزیۆندا رۆشنبیری ئەمازیغی پەخشی دەکات.

لەئابی ١٩٩٤دا مەلیك حەسەنی دووەم بڕیاری زمانی ئەمازیغی دەرکرد، هەروەها بوونی شانۆگەریو ئەفلامو گۆرانی ئەمازیغی کەجەماوەرێکی بەفراوانیان هەنە لەسەرانسەری مەغریبدا، هەروەها ئەمازیغیەکان ناوەندی گرنگیان لەکاروباری بەڕێوەبردنو ئابووری و لەشکرو ئاسایشو پۆلیسدا هەنە.

## سەرچاوەكان:


١ – تیدروبرت غار (تعریب مجدی عبدالحکیم، سامیة الشامی) اقلیات في خطر- ٢٣٠ اقلیة في دراسة احصائیة وسیاسیة واجتماعیة، مکتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٥.

2 – Alan philips, word dictionary of minorities, USA.

٣ – الموقف الثقافي، العدد ٢٤، بغداد، ١٩٩٩.

٤ – نفس المصدر السابق.

5- G. H. Bousquet, les berberes, quesais-je. Paris.

6 – Yves lacoste, les sources dela litterature Algerienne la Nouvelle critique, Numero special, 1959.

7 – Parmontz et par veux, poesies populaire du kaby lie, Ed, layer, 1913.

8 – jean Amrouche, Chants Berberes du kabylie, Paris, 1946.

٩ – مجلة الوسط، العدد ٢٧٤، ١٩٩٧.

١٠ – نفس المصدر السابق.

١١ – نفس المصدر السابق

# کێشەی بیابانی ڕۆژئاوا

## پێشەکی :-

گەلە چەوساوەکانی جیهان سەرنجم ڕادەکێشن، بەش بەحاڵی خۆم کۆشش و هەوڵی زۆر دەدەم کەزانیاریم لەبارەیانەوە زیاد بێ، ئەوەی پاڵی پێوەنام کەلەسەر ئەم گەلە بنووسم ئەوە بوو کێشەی بیابان کێشەیەکە بەزمانی کوردی شتێکی لەسەر نەنووسراوە، جا بەپێویستیم زانی ڕووناکی بخەمە سەر ئەم گەلە چەوساوەیە، دیارە گیروگرفتم هاتنە ڕێ، وەکو کەمی سەرچاوە، بەڵام کە لەپاریس بووم توانیم، هەندێ زانیاری لەسەر کێشەی بیابان وەدەست بخەم، کۆماری دیموکراسی بیابان لەهەمان شوێن لەدایکبوو کەجاران بەبیابانی ئیسپانی پێناسە دەکرا، ئەم کۆلۆنیەی پێشووی ئیسپانیا درێژدەبێتەوە لە ڕۆژئاوا بەهەزار کیلۆمەتر لەسەرکەناری زەریای ئەتڵەسی.

## سنوورەکەی :-

لەباشوورو ڕۆژهەڵاتی مۆریتانیا، لەباکووری مەغریب، لەباکووری ڕۆژهەڵاتی جەزائیرە، کەپایتەختەکەی (العیونە)یە، هەرچەندە تەرفایا ساڵی ١٩٥٨ بەزۆری خرایە سەر مەغریب، لەگەڵ ئەوەشدا پێوانەکەی نزیکەی (٢٨٤) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، ژمارەی دانیشتوانی تاکو ئێستا جێگیر نییە، چونکە کۆلۆنیای ئیسپانی هەوڵیدا بەکەم کردنەوەی چڕی دانیشتوانی تاکو پرۆسەی کۆلۆنیالیزمی بەردەوام بێ، ساڵی ١٩٦٤ ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی بیابان (١٠٠) هەزار

بوو، بەڵام لەسەر ژمێری (١٩٦٧) بوو بە (٢٥) هەزار، لەڕاستیدا ئەمڕۆ گەلی بیابان دەتوانین بەم شێوەیە پۆلینی بکەین، (١٥٠) هەزار پەناهەندە لە ڕەشماڵەکانی سنووری جەزائیر دەژین، نزیکەی (٥٠) هەزار ئاوارەو دەربەدەر لەخوارووی مەغریب دەژین، بەلانی کەمەوە نیو ملیۆن دەبن، فەرمانڕەوایەتی کۆماری بیابان لەنێوان (٥٠٠) هەزار تا یەك ملیۆن دەبێت.

## لەڕووی ئابوورییەوە:-

بیابان وەکو لەناوەکەی بەدەر دەکەوێ وشکی بێدەرامەت نی یە، بەڵکو کۆمارێکی دیموکراسی دەوڵەمەندە، پێش هەموو شتێك فۆسفاتی هەیە، سەرەڕای ڕاگرتنی دەرهێنانی ئەوکانە بەهۆی شەڕەوە، کانگەی بوقویرع تاکو ئێستا بەرهەمی ساڵانەی نزیکەی دووملیار تەنە، جگە لەفۆسفاتی ئاسنی نوێیان لێ دۆزیوەتەوە، هیوای دەرچوونی نەوت لەنێو جەرگەی بیابان دەکرێت، هەروەها ئاماژە بەبوونی یۆرانیۆم و مس و گازی سروشتی لێدەکرێت، سامانی ئاژەڵی لەڕادەبەدەرە، خێڵەکانی قەراغ خەریکی بەخێوکردنی مەڕوماڵاتن بەتایبەتی وشتر کە پلەی یەکەمی هەیە، جگە لەشیرو گۆشت بۆ گواستنەوەو ئاڵوگۆڕکردنی بەچەك و تەقەمەنی و کەلوپەل و چای بەکاردەهێندرێ، کەنارەکانی بیابان سامانێکی چاکی هەیە، کەبۆ ناردنە دەرەوە پشتی پێدەبەسترێ.

## زمان و شیعر:-

بیابانی ڕۆژئاوا کۆلۆنیالیزمی ئیسپانیاو فەرەنسا بوو، بۆیە کاریگەری خۆیان بەسەر گەلی بیابان بەجێهێشتووە، زمانی نەتەوایەتییان کەگفتوگۆی پێدەکەن شێوە زارێکی عەرەبی یە، ووشەی

فەرەنسی و ئیسپانی تێکەوتووە، بەکەلەپووری ڕۆشنبیری هاوبەشی لەقەڵەم دەدەن، شیعری بیابان وەکو باران وایە کتوپڕە، چامەی کورت و سرودە، ڕۆڵی خۆیان بینیوە لەهۆشیارکردنەوەی گەل بۆ خەبات و تێکۆشان و ڕاپەڕین، ناوەرۆکی شیعرەکان بەزۆری چامەی جەنگ و بابەتی شۆڕشگێڕییە، کەباس لە لەشکری ڕزگاریخوازی دەکات، ئاستی هۆنراوەکانیش بەپێی قۆناغە جیاجیاکانی خەباتیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، جگە لەهۆنراوەی ڕامیاری، لەهۆنراوەی دڵداری و سروشت و جوانیشیان هەیە.

## لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە:-

ئەم گەلە لەنێوخۆیاندا هاریکاری یەکتر دەکەن، جیاوازی چینایەتی نازانن، لەمبارەیەوە (ئەرنۆسپیر) دەڵێ:- گەلێکی ساکارو سادەو بەهەست و سۆزن، نموونەی ڕەوشت و ڕاستی و هاریکاری و مێواندارین، سروشت و مۆرکی ئەم گەلە دوورە لەدابونەریتی ئێمە.

## دانپیێدانانی:-

کۆماری دیموکراتی بیابان لە ٢٧ی شوباتی ١٩٦٧دا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ئەندامی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقییە (OUA)، لە ٢٢ی شوباتی ١٩٨٢ یەکێتی گەلانی ئەفریقی دانی پێدانا، زۆر وڵات دانی بەم کۆمارە ناوە، لەوانە کۆماری مالاغاشی یەکەم وڵاتە، دوایی نۆ وڵاتی دیکە هەشتیان لە ئەفریقیان وەکو جەزائیر، ئەنگۆلا، بینان، بوروندی، کینیا- بیساو، مۆزەمبیق، ڕەواندا، ئەلتوگو، جگە لەکۆماری دیموکراسی کۆریا، پاشان لیبیاو یەمەن و هەر هەموویان دانیان بەکۆماری بیابان ناوە، بەهۆی هاوکاری وڵاتانی عەرەبی و ئەفریقی پێشکەوتوو، نوێنەری کۆماری دیموکراسی بیابان چالاکی

فراوان ئەنجامدەدەن و بواری دانپێدانانی دیبلۆماسی تێپەڕاندووە، ئەمڕۆ خەریکە شوێنی خۆی وەکو گەلانی شیلی و ئەنگۆلاو کوباو ڤێتنام جێگیر دەکات، لە ڕۆما پایتەختی ئیتالیا لە (٤-٥) ی شوباتی ١٩٨٧دا کۆنگرەیەکی نێونەتەوەیی بۆهاریکاری گەلی بیابان بەسترا، وەفدی بزوتنەوەی لاوانی فەرەنسی و نزیکەی (٩٥) ڕێکخراوی لاوان کە لەپەنجا وڵاتی ئەوروپی و ئەفریقی و ئەمریکای لاتینی و ئاسیا هاتبوون، هاوسۆزی خۆیان بۆ خەباتی گەلی بیابان لەپێناو مافە ڕەواکانی لەسەربەخۆیی و ئازادی و ئاشتی دەربڕی، ناڕەزایی خۆیان بەتێوەگلانی فەرەنسا لەکاروباری بیابان خستەڕوو. ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقی لە حوزیرانی سالی ١٩٧٦ بە زۆربەی دەنگ داوای بەستنی لوتکەیەکی ئەفریقی کرد بۆ سەیرکردنی کێشەی سەحرا ، بە ئاشکرا مەبەستی خۆیان لەم کۆنکرەیە خستە ڕوو ، کەچاو دەگێڕنەوە بە ماق چارەنوسی گەلی سەحرا بە پێی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە دانی پێداناوە کە پۆلیساریۆ نوینەری گەلی سەحراوی بێ لە کۆنگرەکەدا ، بەلام ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقی کات وشوێنی بەستنی دیاری نەکرد بۆیە حەسەنی دووەم و موختار ولدداده ئەمەیان بەهەل قۆستەوە کۆبوونەوەکەیان دوا خست .لە تەموزی ساڵی ١٩٧٧ لە لیبرفیل لە (الغابون) خولی ئاسایی ساڵانەی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقی ، کات وشوێنێکی نوێی بۆ بەستنی کۆنگرە لە ناوەراستی تشرینی یەکەم لە (لوساکا) دیاری کرد، دیسانەوە ئەم کۆنگرەیە دواخرا ، کۆنگرە بۆ (لیبرفیل) گواستراوە کە لە مارسی ١٩٧٨ ببەسترێ، بەلام(الغابون) داوای لێ بووردنی کرد ، کە ناتوانێ ئەم ژمارە زۆرەی سەرکردەکان پێشوازی بکات.

## مێژووی خەباتی گەلی بیابان:-

لەرووی نەتەوایەتییەوە گەلی بیابان لەپێناوی ناسنامەی نیشتمانیدا تێدەکۆشێ، لەساڵی ١٩٧٣دا دەستەیەك لەخەباتگێڕانی بیابان بەرەو مەغریب و مۆریتانیاو دوورگەی کەناریو ئیسپانیاچوون، داوایان لەجەماوەری ئاوارەو پەڕاگەندەکان کرد کە لەڕەوتی خەبات لەپێناوی گەلەکەیان درێغی نەکەن و لەکاروانی تێکۆشاندا دوانەکەون، دیرۆکی بیابان مێژووی پڕ لەجەنگ و خوێناوی دەگێڕێتەوە، تاکو ئێستاش پاشماوەی گۆڕی پورتوگالیەکان لەخواروودا دیارە کەپێنج سەدە پێش ئێستا ناوچەی بیابانیان خستبووە ژێر چنگی خۆیانەوە، دوای پورتوگالیەکان ڕۆڵی ئیسپانیەکان دێت، ڕامیاری ئیسپانیا بەتەنیا ڕامیارییەکی کۆلۆنیالیزمی پەیڕەو دەکرد، سێ ناوەندی بازرگانی لەکەنار جێگیر بوو بۆ تالان کردنی ولات، پاشان ڕۆڵی کۆلۆنیالیزمی فەڕەنسا دێت، بەتایبەتی لە مۆریتانیاو مەغریبو جەزائیرو سەنیگالدا، ئیسپانیا ڕایگەیاند کە کەناری زێڕو ناوچەی لادێ کە پێی دەڵێن بیابان و مەراکشی ئیسپانیا کۆلۆنیەتی خۆیەتی، بەم جۆرە ولاتی بیابان کەوتە ژێر دەستی ئیسپانیا، تاکو لەساڵی ١٩٣٤دا کۆنترۆڵی پاشماوەی ناوچەکەی کرد، بەدرێژایی سنوور بەرەنگاری دەستی پێکرد، لەهەمان کاتدا دەستدرێژی فەڕەنساش دووبارە دەبۆوە، بەناوی ماف پشکنینی بیابان ناوچەکەی بۆردومان دەکرد، خەباتی گەلی بیابان لەپێناوی سەربەخۆییدا بەشێکە لەبزاڤی ڕزگاریخوازی ناوچەکە، لەپەنجاکاندا بەسەدان سەربازی ناوچەی بیابان لەتەك لەشکری مەراکش لەپێناوی ڕزگاری مەغریب تێدەکۆشان، ڕاپەڕینی نیشتمانی لەتشرینی دووەمی ١٩٥٤دا دەسەڵاتدارانی فەڕەنسای

ناچارکرد کەلەسەرووی ئەفریقیادا ئاسانکاری بکەن، لەساڵی ١٩٥٦دا سەربەخۆیی مەغریبی فەڕەنسیو مەڕاکشی ئیسپانیا ڕاگەیاندران، پاش سەربەخۆبوونی مەغریبی گەورە لەلایەن (علال الفاسی) سەرۆکی (پارتی سەربەخۆیی) خرایە ڕوو، لەسەرەتادا کۆشکی پاشایەتی ئەم بیرۆکەی ڕەتکردەوە لەترسی ئەو گرفتانەی کەلەلایەن فەڕەنسیو ئیسپانیەکانەوە بەرەو ڕوویان دەبێتەوە، لەدواییدا فەرمانڕەوایەتی پادشایەتی کەوتە بیری فراوانخوازی، تەنانەت پرۆژەکەی حەسەنی دووەم لەلایەن فەرەنساو فەرمانڕەوایی (جیسکار)ەوە پشتگیری لێکرا، لە٢٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٠دا کۆماری مۆریتانیا لەچوارچێوەی چەمکی دیگۆلی بۆ دەربازبوون لەژێر دەستەیی چێبوو، لەسەرەتادا پەیوەندی لەگەڵ جەزائیرو هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئەفریقیا بەهێزکرد، پاشان وورده وورده کەوتەوە ژێر چەتری فەرەنسییەکان، پەیوەندی ئابووریو سەربازی لەگەڵ فەرەنسا پتەوکرد، هاونیشتمانی مۆریتانی بە ڕاپاییەوە دەیڕوانییە ئەو سەربازانەی مەغریب کە بۆ یارمەتی لەشکرە بچووکەکەیان هاتبوون، لەدووری چەند کیلۆمەترێك بەرەنگاری گورزەکانی (نواکشوت) دەبوونەوە، بزاڤی نیشتمانی بیابان سەری هەڵدا، کاتێ ژیان جۆرە جێگیربوونێکی بەخۆوە بینی، کەپێشتر لەکۆمەڵگەی خێڵەکیدا نەبوو، لەسەرەتادا ژیانی جێگیربوون لەئەنجامی چەوساندنەوەو وشکایەتی پەیدابوو، هەروەها سوودیان لەکۆچکردنی خێڵەکانی وەکو ئەلعیونو سماداو دکلا لەلایەك، لەلایەکی دیکە حکومەتی ئیسپانی رامیاری نیشتەجێکردنی لە ساڵی١٩٦٧ەوە لەبیابان جێبەجێکرد، بەبیانووی زیادکردنی ژمارەی سەربازەکان تاکو فۆسفات زیاتر بەرهەمبێننو، جۆرەها فەرمانبەری

نـوێ پەیـدا بـبێ، قوتابخانـەیان دامەزرانـد، بیابانیـەکان کـاری بەڕێوەبردنی گرنگییان پێسپێردرا، کۆمەڵەی ناوخۆییان لەچل کەس پێکهێنا، لەهەمان کاتدا پەیوەندی بیابان بەجیهانی دەرەوە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنیکی و ڕۆشنبیری گەلانی دیکەوە گۆڕانی بەسەرداهات، شاری (التنك)بوو بە بنکەیەکی نیشتمانپەروەری و زۆرلەبیابانەکان ڕوویان تێکرد، بزاڤی نیشتمانی ناوچەی بیابان ڕووی لەزیادبوون کرد، بەهۆی ڕامیاری دانەپاڵ کە ئیسپانیەکان لەساڵی ١٩٧٠دا پەیڕەویان دەکرد، لەحەڤدەی حوزیرانی ١٩٧٠دا لە (زملا) لادێی (العیون) یەکەم خۆپیشاندانی نیشتمانی گەورە دژ بەناڕەزایی لەسەر بەستنی کۆبوونەوەی کۆمەڵەی نیشتمانی کەدەسڵاتداریێتی ئیسپانیا مەبەستی بوو، ئەم خۆپیشاندانە بەتوندی سەرکوتکرا، سەرۆکی بیابانیەکان (الباصری) کوژراو وێنەکەی کەوتە ناو هەموو دەوارو دڵێکەوە، پاش دوو ساڵ بزاڤی نیشتمانی توانی ڕێکخراوی خۆی لە ریباتی پایتەختی مەغریب ڕێکبخاتەوەو، هەندێ لەلاوانی سەحراوی گەیشتنە پلەی زانکۆ.

فەرمانڕەوایی ئیسپانیا ویستی ڕامیاری چەواشەکاری بەکار بهێنێ، ڕێکخراوێکی دەستکردی بەناوی بزاڤی پیاوانی شین لەمەغریب ساڵی ١٩٢٧ دروستکرد، بەڵام ئەم ڕێکخراوە دەستکردە بەرامبەر (پارتی یەکگرتووی نیشتمانی بیابان) هەرەسی هێنا، بەمجۆرە (بەرەی پۆلیساریۆ) کورتکراوەی بەرەی رزگاریخوازی جۆگەلەی سوورو کەناری زێڕە) کەلەمانگی ئایار ساڵی ١٩٧٣ چێبوو، لە ٢٠ی ئایار واتە (١٠) ڕۆژ پاش کۆنگرەی دامەزراندن، دەستی بەخەباتی چەکداری کرد، ساڵی ١٩٧٤ سیاسەتی پەیوەستکردنی ئیسپانیا نووشستی هێنا، لەئایاری ١٩٧٥دا نێردراوی نەتەوە

یەکگرتووەکان لەسەر داوای دەسەڵاتداریێتی ئیسپانیا بانگکرا، خۆپیشاندانێکی گەلی لەلایەن پۆلیساریۆوە ڕێکخرا، کەداوای چوونە دەرەوەی ئیسپانیاو نەبۆ مەغریب و مۆرتیانیا، نەدانەپاڵ و دابەشکردن، بەڵکو ئێمە گەلێکی بیابانین، مەغریب و جەزائیرو مۆریتانیایی نین، نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەهەموو شارو شارۆچکەکان (العیون، دورا، بوقویرع، نشیلا، زنمور، محبس، سمارا، دکلا، اوسرد، تفاریتی، عرقوب، لاغویرا..هتد) ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی لەهەموو روویەکەوە ئامادە کرد، کەئامارەیان بەوەکرد کەتەنیا دوو کەس لەبەرژەوەندی مەغریب خۆپیشاندانیان کرد، هەروەها جەختیان لەسەر بەرەی پۆلیساریۆکرد، کەهێزێکی رامیاری دەسەڵاتدارە لەوڵاتدا، پاشان نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرەو مەغریب و پەناهەندە بیابانیەکانی جەزائیر لەتندۆف چوو، لە تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٧٥ دا بێ ئەوەی حەسەنی دووەم چاوەنواڕی بڕیاری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان بێ، بڕیاری گەڕاندنەوەی ئاوارەکانی بیابانی دەرکرد، پاش ئەوەی بڕیاری دادگەی دادپەروەری نێودەوڵەتی ڕەتکردەوە لەبارەی ناکۆکی ئیسپانیادا، لە ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٥ دا ئیسپانیا بەڵێنیدا کەناوچەکانی بیابان بە مەغریب و مۆریتانیا بداتەوە، کەدواکشانەوەی لە٢٨ی شوباتی ١٩٧٦ دا دەبێ، لە٣٠ی ئۆکتۆبەر پاشای مەغریب لەشکری هەنارد بۆ داگیرکردنی بیابان، پاش چەند رۆژێك لەشکری مەغریب شوێنی لەشکری ئیسپانی گرتەوە، شەش مانگێکی ویست تاکو هەموو شوێنەکانی خستە ژێرچاودێری خۆیەوە، دەسەڵاتداریێتی بیابان لە٢٧ی شوباتی ١٩٧٦دا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند.

ئـەمڕۆ لەشـكری رزگـاریخوازی بیابـان بەسـەر هـەموو وڵات زاڵـەو لەلایەن هێزی مەغریبییەوە ڕامیاری سووتاندنی زەوی پـەیڕەو دەكرێ، بۆردومانی دەوارنیشـنەكان بۆتە مایـەی ئەوەی كە پەناهەنـدەكان روو لـەزیادبوون بكـەن، ئـەم دەوارنشـینانە بەدرێـژایی دەیـان كیلۆمـەتر لەناوچەی تندۆف درێژ دەبنـەوە، شتێكی زەحمەتە بزاڤی پۆلیساریۆ وەكو ڕێكخراوێكی رامیاری لەبەڕێوەبردنی شارستانی جودابكرێنەوە، ئـەم بەڕێوەبردنـەش چـەند وەزارەتێـك دەگرێتـەوە، وەكـو پـەروەردە، تەندروسـتی، داد، پـارەدان و بـەخێوكردن، هـەموو كاروبارەكـان بەڕێكوپێكی ئەنجامدەدرێن.

(ئەڕنوسـپیر) رۆژنامەنووسـێكی فەرەنسـییە سـەردانی دەوارنشینەكانی كردووە لـەم رووەوە دەڵـێ:- لـەڕووی بەڕێوەبردنـەوە بەسـەر سـێ ویلایـەت دابـەش دەبـێ، وەكـو ویلایـەتی العیـون، سمـارا، دكـلا، هـەر ویلایـەتێكیش بەسـەر حـەوت بازنـەدا دابـەش دەبـێ، هـەر بازنـەیـەكیش (٦-٧) هـەزار كـەس تێیـدا دەژیـت، قوتابخانـەی تێدایـە، كـوڕو كـچ بابـەتی ئـاییـنی و رامیـاری دەخـوێنن، فێـری خوێنـدن و نووسین و سروودی نیشتمانی دەكرێن، لەبەر ئەوەی بارودۆخ هـەردەم لـەبار نییـە، بۆیە كاروباری سـەر بەنەتەوەیـەكگرتووەكان لەبەرنامـەی ساڵی ١٩٧٦دا (١٢)ملیۆن دۆلاری یارمـەتی بۆ پەناهەنـدەكانی بیابان تەرخانكرد، بەڵام دەوارنشـینەكان بـەهیوای گەڕانـەوەن بۆ شـارەكانیان ، (تفـاریتی) شـارێكی بچـووكە مـەغریب داگـیری كـردووە، هـەموو بەیانیـەك بـەرەنگاری هێـزی پۆلیسـاریۆ دەبێتـەوە، دانیشـتوانی شـارەكەیان چۆلكردووە لەسـاڵی ١٩٧٨دا فەرەنسا خـۆی لـە ئەفریقیا تێوەگلانـدەوەو یارمـەتی مۆریتانیایـدا دژ بـەهێزەكانی پۆلیسـاریۆ لەبیابانی رۆژئاوادا.

## کێشەی بیابانی رۆژئاواو کەناڵی دیپلۆماسی:-

لەم دواییەدا وابلاوکرایەوە کەشای مەغریب (محەمەدی شەشەم)و سەرۆکی جەزائیر (عبدولعەزیز بۆتەفلیقە)کۆدەبنەوە بۆچارەسەرکردنی کێشەی بیابانی رۆژئاوا، کوفی ئەنان ڕایگەیاند کە رۆڵی ناوبژیوانی دەبینێ، هەروەها (جیمس بیکەر) وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا ئەم کارەی گرتۆتە ئەستۆ، بەرێکخستنی دیدەنی نێوان حکومەتی مەغریب و پۆلیساریۆ، دوای ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕایگەیاند کە ڕێکخستنی ڕاپرسی شکستی هێنا کەدەبوایە لەتەموزی ٢٠٠١ ئەنجامبدرێ، بەهۆی کۆمەڵێ گرفتەوە دواخرا، بۆ نموونە کێ ماف دەنگدانی دەبێ؟ هیچ لایەك ڕازی نابێ کەدەنگ لەسەر ئەوە بدات، نەتەوەیەکگرتووەکان ویستی بێ ڕەزامەندی مەغریب ڕاپرسی جێبەجێ بکرێت، مەغریبیەکان کەوتنە رەخنەگرتنەوەو گووتیان نەتەوەیەکگرتووەکان شێوازی نادیموکراسییانەی لەبیابانی رۆژئاوا گرتۆتە بەر، مەغریب لیستێکی (١٨٢) هەزارکەسی لەناوچەی بیابانی خستەڕوو بۆ ڕاپرسی، نێردراوی (مینیۆرسو) پەنجا هەزاری لێ وەدەرهێنا کەهیچ پێوانەیەك نایانگرێتەوە، ئەم لیستەش بە مەغریب درایەوە، لیستی نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەم شێوەیە بوو، ژمارەی بیابانەکانی مەغریب (٤٦٢٥٥) لەدەوارنشینەکانی تندۆف، لەجەزائیر (٣٣٧٨٦)و، سەرووی مۆریتانیا (٤٢١٠)، ئەمەش بێ ئەنجام مایەوەو سەری نەگرت، بەمجۆرە دانیشتنی نێوان محەمەدی شەشەم و عەبدولعزیز بۆتەفلیقە بەداخراوەیی مایەوە، تەختکردنی کێشەکە بەگوێرەی مەغریبەوە کەبەهیچ شێوەیەك لەگەڵ دەوڵەتێکی بیابان نی یە، بەڵکو دان بەئۆتۆنۆمی دادەنێ، بەگەڕانەوەی هەموو بیابانەکان، کاتێ

پۆلیساریۆ بەمە ڕازیبوو، سەرکردەی پۆلیساریۆ پلەوپایەکی مەزنی لەلایەن دەوڵەتەوە پێدەدریٚ، هەروەها ناوچەیەکی بازرگانیو ئابووری لەنێوان بیابانی مەغریبو بیابانی جەزائیر دروست بکرێت، ئەگەر ئەم شتانە بەباشی ڕۆیشت ئینجا ڕاپرسی ئەنجامدەدرێت، بۆ ڕاپرسیش پەیڕەوی ئەم خاڵانە دەکرێت کەلەسەر بنەڕەتی کەلەنێوان مەغریبو پۆلیساریۆ لە (هیوستن) ڕێککەوتن بەسەرپەرشتی جیمس بێکەر لەساڵی ١٩٩٧دا.

١- کێ ماف دەنگدانی دەبێ، بەگوێرەی ئەو ئامارانەی کە نەتەوەیەکگرتووەکان دیاریکردووە تەنیا ئەو کەسانەی لەبیابان هاتوونو پەناهەندەکانی تندۆف بۆ شارەکانی بیابان بگوێزرێنەوە.

٢- دیلە ڕامیارییەکانو دەستبەسەرەکان ئاڵوگۆڕ پێبکرێت، پۆلیساریۆ ژمارەیەك دیلی جەنگی مەغریبی ئازاد کرد کە هەندێکیان لەساڵی ١٩٨٠وە دەستبەسەربوون، پادشای مەغریب سەردانی دیلەکانی لەشاری ئەغادیر کرد.

٣- هێزی سەربازی بەگوێرەی هەردوولا دابەش بکرێت، ڕێککەوتن کەهێزی مەغریبی لەناوچەکە بمێنێتەوە، لەهەمانکاتدا چەکدارەکانی پۆلیساریۆ کەژمارەیان لەنێوان (١٥٠٠-٥٠٠٠) چەکدار دەبن لەسنوری مەغریب، جەزائیر، مۆریتانیا دەمێننەوە، بەرەی پۆلیساریۆ پێشنیاری گواستنەوەی چەکدارەکانی بۆ ناوچەی بیابان ڕەتکردەوە.

٤- مەغریب بەسەربەستی لەناوچەکە دەمێنێتەوە، شورایەك لەنێوان بیابانو شارەکانی دیکەی مەغریب دروستبکرێت، ئەو مەغریبیانەی کەسەر بەناوچەکە نین دووردەخرێنەوە، مەغریب ناوچەکە بەڕێوەدەبا، تاکو ڕاپرسی تەواو دەبێ، بەڵام مەغریب ڕەتی ئەوەی کردەوە کەشورایەك لەنێوان بیابانو شارەکانی مەغریب

چێبکرێ، هەروەها رەتیکردەوە کەئەو مەغریبیانەی کەلەناوچەکە هەن بگوێزرێنەوە.

٥- پۆلیساریۆ پێشنیاری هەڵکردنی ئالآی کۆماری بیابانی کرد لەکاتی ڕاپرسیدا، بەڵام جیمس بێکەر ئەم پێشنیارەی پۆلیساریۆی رەتکردەوە لەسەر بنەمای ئالاّ بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەبێ لەگەڵ باری پۆلیساریۆ ناگونجێ.

دانیشتنەکان بێ ئەنجام دەرچوون، چونکە مەغریب لەمەرجی خۆی نایەتە خوارەوە، مۆریتانیاو جەزائیریش لەکاتی بەستنی کۆبوونەوەکان یاخود لەکۆتاییدا هۆڵەکە بەجێدەهێڵن، بەم شێوەیە کێشەی بیابانی رۆژئاوا بۆتە تراویلکەی بیابان، کۆفی ئەنان سکرتێری نەتەوەیەکگرتووەکان ڕاپۆرتێکی ڕەشبینانەی پێشکەش بە ئەنجومەنی ئاسایش کرد کەکێشەی بیابان هیچ پێشکەوتنێکی بەخۆوە نەبینیوەو، جەختی لەسەر لایەنی ناکۆکی کرد کە رێگەیەکی دیکە جگە لەڕاپرسی بدۆزنەوە، ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاریدا بەدرێژکردنەوەی ماوەی مینیورسۆ تاکو تەمووزی ٢٠٠٢/٧/٣١، جیمس بێکەر نێردراوی تایبەتی نەتەوەیەکگرتووەکان و وەزیری پێشووی ئەمریکا بەردەوامە لەهەوڵەکانی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان مەغریب و بەرەی پۆلیساریۆ لەسەر بیابانی رۆژئاوا، ئەنجومەن رایگەیاند ئامادەن بۆ لێکۆڵینەوەی هەر بڕیارێك کەکۆفی ئەنان و بیکەر بیخەنەڕوو بەمافی چارەنووسیشەوە بۆ کێشەی بیابان کە ٢٧ ساڵە درێژەی هەیە، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩ی شوباتی ٢٠٠٢ ئامارەی بەم خالاّنە کرد، تاکۆتایی بەکێشەکە بهێنێ:-

١. داوا لە ناوچەکە دەکات کەهاریکاری سکرتێرو نێردراوی تایبەتی بکەن.

٢. هەروەها لەگەڵ کاربەدەستانی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەناهەندەکان هاوکاری بکرێت.

٣. داوا لە مەغریب و پۆلیساریۆ دەکات کەهاوکاری لیژنەی خاچی سووری نێودەوڵەتی بکەن بۆ دیاریکردنی چارەنووسی هەموو ئەو کەسانەی کەلەسەرەتای ناکۆکیدا ونبوون.

٤. خۆشحاڵ دەبێ بەئازاد کردنی (١٠٠) دەستبەسەری مەغریبی و، داوا لە پۆلیساریۆ دەکاتکە بێ دواکەوتن هەموو دەستبەسەرەکان ئازاد بکات.

٥. بڕیاریدا کە مینیورسۆ درێژە بەکارەکەیان بدەن، تاکو ٢٠٠٣/١/٣١.

٦. داوای لەسکرتێری گشتی دەکرێ کە لەکۆتاییدا راپۆرتی خۆی لەڕاسپاردەو پێشنیار بخاتە روو:-

## کۆتایی:-

لەکۆتاییدا دەگەینە ئەم ئەنجامانەی لای خوارەوە، کەکێشەی بیابانی رۆژئاوا ئاڵۆزکراوە بەتایبەتی لەلایەن حکومەتی مەغریبەوە، چونکە مەغریب چاوی بڕیوەتە ئەو سامانەی بیابان و ناتوانێت وا بەسانایی دەستبەرداربێ، کێشەکە زۆر چۆتە پێش، چونکە چەندان وڵات دانی پێداناوە لەبواری دیبلۆماسیدا شوێنی دیارە، نەتەوەیەکگرتووەکان بایەخی پێدەدەن، بۆ خۆشیان لەکۆششکردنن بۆ بنیادنانی کۆماری بیابانی رۆژئاوا، رەنگە ئەگەر کار وابڕوات لەدوارۆژیش ناوچەی بیابانی رۆژئاوا وەکو وڵاتێك لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکان و زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی دنیا سەودای لەگەڵ بکرێت.

## سەرچاوەكان

1- L Etat Du Monde, Ed. La Decouverte, Paris, 1985.
2- Nouvelle critique, No 113, Paris, 1978.
٣- حسن اغا، احمد الخالدي: العالم الثالث والدول المحيطة بالمنطقة العربية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٨٢.
٤- مجلة الوسط العدد (٤٢٧)، ٢٠٠٠.
٥- مجلة الوسط العدد (٤٣٦)، ٢٠٠٠.

# مەکەدۆنیا

مەکەدۆنیا ناوچەیەکی جوگرافی دیاری کراوە، سەرووی چیای سکوبسکاتسرناجوراو چیای بلانینایە، رۆژهەلاتی چیای (دیلاورودوب)ە، خوارووی کەناری دەریای ئیجەیە، رۆژئاوای دەریای ئوهریدو دەریای بریسبایە پێوانەکەی (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزارچوارگۆشەیە، ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی دوو ملیۆن کەس دەبێت، زۆربەی لەکۆماری مەکەدۆنیا دەژین کە ٦٧٪ی مەکەدۆنین و ١٩٪ی ئەلبانی‌یەو لە ٤٪ی تورکن، مەکەدۆنیا ناوچەیەکە، لە نێوان یۆغسلافیاو بولغاریاو یۆناندا دابەش بووە.

زمانێکی ڕەسمی نی‌یە لە یۆغسلافیادا بەڵکو سێ زمان هەیە، زمانی سلۆڤانی، زمانی سڕبی، زمانی کرواتی‌و مەکەدۆنی نزیکە لەزمانی بولغاری کە بەپیتی سریلیکی دەنوسرێ. ئاینی مەکەدۆنیەکان ئەرسۆدۆکسین، بەلام هەندێ لە مەکەدۆنیەکان ئەرسۆدۆکسی نین، بەڵکو موسلمانن، کێشەی نێوان کۆماری مەکەدۆنیاو یۆنان بۆ کۆنگرەی بەرلینی ساڵی (١٨٧٨) دەگەڕێتەوە. بۆیەکەم جار کێشەی مەکەدۆنیا لەلایەن ئەوروپیەکانەوە بەگەرمی بایەخی پێدراو لەکۆنگرەی ناوبراودا یۆنانیش بەشداری تێداکرد، بڕیاردرا کەماڤی ئۆتۆنۆمی بەمەکەدۆنیای ژێردەسەلاتی عوسمانی بدرێت، بەلام ئەم ئاواتە نەهاتە دی چونکە لەلایەن بولغاریاو سڕبیاو یۆنانەوە نارەزایی بەرزبوونەوە.

پاش شکانی سڕبەکان لەبولغاریا ساڵی ١٨٨٥، سیاسەتێکی پاوانخوازییان لە مەکەدۆنیادا پەیڕەو کرد، کەپێیان دەوتن سڕبی خواروو، هەروەها بڵاویان دەکردەوە کە مەکەدۆنیەکان سلاڤین و سربین، تەنانەت موسڵمانەکانیش، سربەکان کۆمەڵەیەکیان بەناوی (سانت ساڤا) لەساڵی ١٨٨٦دا پێکەوەنا.بەمەبەستی پڕوپاگەندە کردن بۆ نەتەوەی سڕبی بوو سڕبەکان دەیان ووت کەزیاتر لە سەد قوتابخانەی سڕبی لەمەکەدۆنیا هەیە، زیاتر لە (٦٠٠) قوتابخانەی بولغاری هەبوو کە زۆربەیان لەژێر چاودێری کلێسەی بەتریرکی بوون، زمانی سڕبی بووە زمانی ڕەسمی لە قوتابخانەکاندا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەهەستی مەکەدۆنیەکان بەرەو بولغارەکان بچێ، یۆنانەکانیش وەکو سڕبەکان کۆمەڵەیەکیان بەناوی (ئیسنیل) هیتریا پێکەوەنا، ئامانجی ڕزگارکردنی هەموو یۆنانیەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانلی بوو، تەنانەت ئەوانەش کە لەمەکەدۆنیابوون و بەزمانی سلاڤی دەپەیڤن، ناوی کۆمەڵەکەشیان نا (یۆنانیەکانی کە بەسلاڤی دەدوێن) سێ لەسەر چواری ئەفسەرەکانی لەشکری یۆنایی لەهەوادارانی ئەم کۆمەڵەیە بوون، ساڵی ١٨٩٠ پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە (١٤٠٠)هەزارو چوار سەد قوتابخانەی یۆنانی لە مەکەدۆنیا هەیە.

مەکەدۆنیەکان ساڵی ١٨٩٣ ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی ناوەکییان پێکهێنا کە بەربەرەکانی دابەش بوونی مەکەدۆنیای دەکرد، هەروەها بیرۆکەی دروستکردنی یەکێتی فیدڕاڵی سرب و مەکەدۆنی و بولغاری خستەڕوو، لایەنگرێکی زۆری پەیداکرد، بەڵام لە ئەنجامی تێکچوونی بولغاری گەورە لەپەیمانی (سان ستیڤانۆ)دا بەشێکی زۆری مەکەدۆنیەکان بۆ بولغاریا ڕایان کرد، ساڵی ١٩٠٣ نیوەی پایتەختی

سۆفیا پەناهەندەو ئاوارەی مەکەدۆنی بوون. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەماوەیەکی زۆر بولغاریا ئارامی بەخۆوە نەبینیّ، هەروەها ڕێکخراوێکی دی دروست بوو بەناوی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی دەرەکی کە ڕکەبەرایەتی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی ناوەکی دەکرد، ئامانجیشی دروست کردنی بولغاری گەورەبوو، شەڕی یەکەمی بەلقان لەساڵی ١٩١٢ دەستی پێکرد کەبولغاریاو سربیاو یۆنانیا هاوپەیمان بوون بۆ بەتاڵ کردنی ناوچەکە لەعوسمانیەکان و دابەشکردنی مەکەدۆنیا. بەم جۆرە پاش ئەوەی گەلی سلاڤی مەکەدۆنی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانلی ڕزگاری بوو، ناکۆکییەکی گەرم کەوتە نێوان هاوپەیمانەکان، لەسەر دابەشکردنی مەکەدۆنیا ناکۆك بوون. بولغاریا بەبەشی خۆی ڕازی نەبوو، بۆیە شەڕی بەلقانی دووەم لەساڵی ١٩١٣ دەستی پێکرد ئەم جارەیان بولغاری دژی سربیا و یۆنان لەساڵی ١٩١٣ جەنگا، مەکەدۆنیا بەسەر سیّ دەوڵەت دابەشکرا، بەشەکەی سربیا پێی دەوترا (ڤاردار مەکەدۆنیا)، ناوچەی ژێر دەسەلاّتی بولغاریا پیّی دەوترا،(پیرین مەکەدۆنیا)، ئەو بەشەی بەر یۆنان کەوت بەناوی (ئێگیسکا مەکەدۆنیا) بوو.

لەئەنجامدا مەکەدۆنیا تووشی هێرشێکی دڕندانەی سرب و بولغارو یۆنان بوونەوە، ساڵی ١٩١٩ هەرسیّ وولاّت بولغارو یۆنان و سرب دەستیان کرد بەتواندنەوەی مەکەدۆنیەکان لەڕووی نەتەوایەتیەوە، بولغارو سربیا باوەڕیان وابوو بەئاسانی دەتوانن بیان تاوێننەوە، بەلاّم یۆنان باوەڕی وابوو بەکارەسات بەسەریاندا زاڵ دەبن، زمانی دایکیان لیّ قەدەغەکرا، دەستکرا بەگۆڕینی ناوەکانیان وەکو ناوی (lerin) لێرین بوو بە فلۆرینە (Florina)، ڤۆدین (Voden) بوو بە (Edessa) ئێدیسە، کوکس بوو بە (Kilkis)

کیلکیس. لەساڵی ١٩٢٦ لەشەڕی نێوان تورك و یۆناندا نزیکەی (١٢٦,٠٠٠) مەکەدۆنی دەرکران، جارێکی دی لەساڵی ١٩٤٩دا دیسان بەسەدان مەکەدۆنی لەیۆنان وەدرنران، ئێستا نزیکەی (٢٥٠,٠٠٠) مەکەدۆنی لەیۆنان ماونەتەوە.

لەراپۆرتی ساڵی ١٩٩٤ی چاودێری ماف مرۆڤی نیویۆرك هاتووە دەڵێ:- کەمە نەتەوەی مەکەدۆنیا، بوون یان هەیە، بەڵام مافیان پێشێڵ دەکرێ، بەئاشکرا ناتوانن بەزمانی خۆیان قسە بکەن، هەروەها بەناوی راستەقینەی خۆیان بانگ ناکرێن، لەپەنجاکاندا کۆمۆنیستەکانی یۆنان بەڵێنیان پێ دەدەن کە ئەگەر دەسەڵات بگرنە دەست ئەوا دان بەمافی سەربەخۆیی مەکەدۆنیەکان دەنێن.

لەشەڕی دووەمی جیهانیدا بولغاریا، مەکەدۆنیا ژێر دەسەڵاتی یۆغۆسلافیای داگیرکرد، هەرچەندە هیتلەر رێگای بەبولغاریانەدا کە ئەو شوێنانەی لەیۆنان و یوغسلافیا داگیری کردبوو، بیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، بەڵام بولغاریا وەکو خاکێکی بولغاری مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، فەرمانبەری خۆی بۆ مەکەدۆنیا هەنارد، مامۆستای قوتابخانەکانی گۆڕی بەمامۆستای بولغاری، لەسەرەتادا مەکەدۆنیەکان لەم هەنگاوانەدا پێشوازییان لێکردن، بەڵام لەدواییدا بولغارەکان وەکو داگیرکەر هەڵسوکەوتیان دەکرد، خەڵکی مەکەدۆنیاش ڤاردار مەکەدۆنیا بێ هیوا بوون.

دارو دەستەی تیتۆ لەسەرەتادا لە مەکەدۆنیا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، چونکە لایەنگری بولغارەکان بوون، لەکۆتایی ١٩٤٣دا جەماوەری دارودەستەی تیتۆ زیادی کرد، چونکە هەستی مەکەدۆنیەکان بەرامبەر بولغارەکان گۆڕاو چوونە پاڵ تیتۆوە لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا دەست و پێوەندەکان بە سەرۆکایەتی تیتۆ

کۆماری مەکەدۆنیایان دروست کرد، بۆئەوەی ببێتە پردێك لەنێوان یۆغۆسلافیاو بولغاریادا سەرۆکی بولغاریا دیمترۆف خۆشحاڵ بوو بەبیری تیتۆ بۆیەکگرتنەوەی، ڤاردار مەکەدۆنیای یۆغۆسلافیا لەگەڵ(پیرین) مەکەدۆنیای بولغاریا، بەڵام ئەم هاریکاریە کورت بوو چونکە تیتۆ لەکۆمنترن ساڵی ١٩٤٨ دەرکرا، نێوانی کۆماری مەکەدۆنیا و بولغاریا خراپ بوو بەم شێوەیە دەسەڵاتی کۆمۆنیزم ساڵی ١٩٤٦ بەشی زمانی مەکەدۆنی لەکۆلێژی فەلسەفە لە پایتەختی سکۆب کردەوە، ساڵی ١٩٥٣ ئامۆژگای زمانی مەکەدۆنی کرایەوە، هەروەها کتابێکی زۆر لەسەر مێژووی مەکەدۆنیا چاپ کرا. کلێسەی ئەرسۆدۆکسی مەکەدۆنی لە کلێسەی ئەرسۆدۆکسی سڕبی جوداکردەوە، ئەم ئەهەنگاوانە هەنگاوی گرنگ بوون بۆ نەتەوەی مەکەدۆنی نوێ، ساڵی ١٩٦٧ کلێسەی مەکەدۆنی سەربەخۆیی خۆی وەرگرت، کلێسەی ئەرسۆدۆکسی سڕبی دانی بە کلێسەی مەکەدۆنی دانەنا، بەم جۆرە میری توانی هەستی خەڵکی بەرامبەر بەخۆی ڕابکێشێ و لە بولگارەکانی بکاتەوە، هۆشیاری نەتەوەیی لەمەکەدۆنیا پەرەی پێدرا، کەمە نەتەوە بوونە، گەلێکی سەربەخۆ لەچوارچێوەی یەکێتی فیدراڵی یوغۆسلافیادا، بەڵام باری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی یۆغۆسلافیا لەهەشتاکاندا بەرەو خراپی چوو، ئەمەش مەکەدۆنیای گرتەوە، دوای ئەو گۆڕانکاریانەی کەلە ساڵی ١٩٨٩ دا ڕوویدا، یۆغۆسلافیا و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی گرتەوە شیوعیەکانی دەسەڵاتداری مەکەدۆنیا ڕێگایان بەفرە حیزبیداو یەکێتی فیدراڵی یۆغسلافیا هەڵوەشایەوە، ساڵی ١٩٨٩ دەستوری نوێ داڕێژرا لەجیاتی دەوڵەتی گەلی مەکەدۆنیا کەمە نەتەوایەتیەکانی ئەلبان و تورك بوون بەدەوڵەت و نێو نەتەوەیی گەلی مەکەدۆنیا. تیپی وەرزشی

تۆپی پیٚ هاواریان دەکرد و دەیان وت(دیرسالون) هی ئیٚمەیە، لەسەر سنووری سرب و مەکەدۆنیایە، ساڵی ١٩٥٣ بە سربیا درا، هەروەها هاواریان دەکرد بژی یەکیٚتی مەکەدۆنیا، رۆشنبیرەکانی مەکەدۆنیا ساڵی ١٩٩٠(بزوتنەوەی کاربۆ هەمووان)(MAAK) یان لەمەکەدۆنیا چیٚکرد، بەسەرۆکایەتی شاعیرو سەرۆکی نووسەران(ئەنتی بۆبۆڤسکی). لە ٤ی فیٚبریوەری ١٩٩٠دا خۆ پیٚشاندانیٚکی گەروە نزیکەی سەدو بیست هەزار مەکەدۆنی لەپایتەختی سکۆبی سازیدا بۆ جەخت کردنە سەر شوناسنامەیان و ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر چەوساندنەوەی مەکەدۆنی بولغاریا و ئەلبانیا و یۆنان، خۆپیشاندانەکە لەکاتی سەردانی سەرۆك وەزیرانی یۆنان (کۆنستانتین میسۆتاکیسی) بوو، بلغراد سەربەخۆی مەکەدۆنیای ناویٚ، دەیەویٚ لەژیٚر چوارچیٚوەی سربیا بیٚت، هەروەها یۆنانەکانیش چونکە مەکەدۆنیا ئەگەر سەربەخۆ بیٚت، گیروگرفت بۆ مەکەدۆنیای یۆنان چیٚ دەکات.

لەمانگی یونی ١٩٩٠دا بزوتنەوەی مەکەدۆنی شۆڕشگیٚڕو حیزبی یەکیٚتی نیشتمانی دیموکراسی دروست بوون، سەرۆکی حیزب (جیورجی ئیڤیسکی) هەوڵ و کۆششی دەکرد بۆ یەکگرتنەوەی مەکەدۆنیەکان لەدەوڵەتیٚکدا، چاککردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆماری سلۆڤینیا و کرواتیا، لەمانگی ئاگوستی (١٩٩٠)دا ڕیٚکخراویٚکی دی دروست بوو. کەلایەنگری بولغاریا بوو.

ئەم ڕیٚکخراوە ناوی (بولغاریا ڤاردار مەکەدۆنیا) بوو ئەم ڕیٚکخراوە دژی بیری نیٚو نەتەوەیی مەکەدۆنی بوو، لەهەمان کاتدا بانگاشەی یەکیٚتی مکەدۆنی یۆغۆسلافیا و یۆنان و بلغاریای ڕادەگەیاند.

## سەرچاوەکان.

1- Tidskriften makedonia, N 4,1994.
2- Tidskriften makedonia, No 7, 1995.
3- Alan philips: Word directory of minorities USA.
4- Laszlo Hamori, Erik Gate: Words politiskt Lexikon stockholm, 1967.

# مێژووی خەباتی گەلی چیچان

چیچانیەکان بە زیرەکی و ئازایەتی و ڕووخۆشی یەوە ناسراون، هەرکە تەنگەتاو بکرێن بەرەو چیاکانی قەفقاس مل دەنێن.
نهێنی ئەم سەرکێشی یەو یاخیبوونە لەم پارچە زەوی یەدا. بۆ خێڵەکی گەلانی قەفقاس دەگەڕێتەوە کە چیچانیەکان کۆنترین و ڕەسەن ترین گەلانی ناوچەکەن، کە هەر لەدێر زەمانەوە لەلایەن ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی و فارسی و عوسمانی و ئەڵمانیەوە شەڕیان پێ فرۆشراوە چونکە شوێنێکی ستراتیجی باش و سامانێکی بەفەڕی لەنەوت و کانیان هەیە.

## شوێنی جوگرافی:-

چیچان دەکەوێتە خاڵی درێژەوە بووی سەرووی چیای قەفقاسی مەزنەوە لەنێوان دەریای ڕەش و دەریای خەزەردا بەدرێژایی سەدو بیست کیلۆمەتر لەسەر کەنارەکانی خوارووی ڕووباری تورکی مێژوویيدا درێژ دەبێتەوە.
لە باکوورو رۆژهەڵاتەوە وڵاتی داغستانە، لەباشووری ڕووباری (ئاندی)یە، لەرۆژئاوادا وڵاتی (ئەنغوش)ە.

## بنەچەی چیچانیەکان:-

(هیرۆدۆت) لەبارەی بنەچەی چیچانەکانەوە دەڵێت: چیچانیەکان لەوەچەی شەرکەسن کە لەکەنارەکانی رۆژهەڵاتی دەریای قەزوین

دەژیان بەر لەوەی ڕووبکەنە ڕۆژهەڵاتی قەفقاس و لەکەناری (ڕووباری تورك) جێگیر بن.

دانیشتوانی سەرووی قەفقاس کە لەگەلانی وبناخ و ئەدیغەو ئەستین و داغستانی و ئازەری و جۆرجی و ئەرمەن و کورد پێك هاتوون، بەسوار چاکی و جوامێری و بەژن و باڵا کەڵەگەتی بەناوبانگن، ژمارەی دانیشتوانیان دەگاتە نزیکەی بیست و سێ ملیۆن.

## مێژووی داگیرکردنی چیچان

بۆ جاری یەکەم ساڵی ٧٣٧ زایینی لەشکری ئیسلامی گەیشتە خوارووی قەفقاس و توانی سەرکەوتن وەدەست بهێنێ و حکومەتی ئیسلامی دابمەزرێنێ کەزیاتر لەچوار سەد ساڵی خایاند. ساڵی ١٢٣٦ جەنگیزخانی مەغۆلی قەفقاسی داگیرکردو دەستی کرد بەتێکدان و وێران کردنی، دوای خۆی تەیمور لەنگ کەوتە گیانی دانیشتوانەکەی و بەناچاری بەرەو چیاکان ملیان نا.

## روسیا لەگەڵ چیچانیەکاندا

ساڵی ١٥٠٠ زایینی روسیای قەیسەری بایەخی بە قەفقاسدا. کاتێ هەواڵی شەق کردنی کەناڵی نێوان ڕووباری (دۆن و ڤۆلگای) بیست لەلایەن عوسمانیەکانەوە، روسیا بڕیاریدا کەناوچەکە داگیر بکات و پڕۆژەکە هەڵوەشێنێتەوە، لەلایەك خۆی بگەیەنێتە دەریای خەزەر بۆ مسۆگەرکردنی ناوچەی ئاوی گەرم، لەلایەکی ترەوە هەڕەشە لەبەرژەوەندی بەریتانیاش بکات، بەڵام تەتەری قەرەم بەرەنگاریان بوونەوە بەرەو مۆسکۆیان کردنەوە. هەرچەندە ڕوسەکان بەشەڕو ناکۆکیەوە لەگەڵ (کۆلۆنیالات)ی غەربیدا خەریك بوون، توانییان کۆنترۆلی قەفقاس بکەن، ڕۆمان نووسی گەورەی ڕوسیا

تۆلستۆی (باپیری رۆمان نووسی ناسراو) بترسی گەورە ساڵی ١٧٢٢ ڕاپۆرتێکی نهێنی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ڕووس لە باشووردا بەفراوان بێت، ساڵی ١٧٣٩ قەیسەرەکان گەیشتنە دەریای ئازۆف ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نەیتوانی بەرەنگاریان بێتەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەهانی قەیسەرەکان بدات (کاترینی دووەم) هێڵی قەڵایی دروست بکات، لە قەفقاس و بەدرێژایی چیچان لە ڕووباری تورکەوە تاکو دەریای ئازۆف لە ئەنجامدا عوسمانیەکان شکان، لە ساڵی ١٧٧٤دا بەپێی ڕێککەوتنی قەرەم وازیان لەناوچەکە هێنا و قەیسەرەکان بەدرێژایی دەریای ڕەش، شوێن پێی خۆیان بەهێز کرد، بەهۆی شەڕوشۆڕو گەمارۆی درێژخایەنەوە، دانیشتوانی قەفقاس تووشی کوشتن و لەناوچوونی بە کۆمەڵ بوون. بەهەزاران گوندەکانیان بەجێهێشت، ئەم هەموو کارەساتانە ڕێگای لەبەرگری کردن و ڕزگارکردنی (ئەنجلن) نەگرت، توانییان لەوێدا ئیمارەتێکی سەربەخۆ پێکەوە بنێن، ساڵی ١٨٢٨ شەڕێکی درێژخایەن لەنێوان ڕوسیای قەیسەری و دەوڵەتی عوسمانی ڕوویدا، کە نزیکەی سێ سەدەی خایاند، تاوەکو گەلانی قەفقاس بەتایبەتی چیچانیەکان ئازادبوون، (لیوتۆلستۆ)ی ڕوماننووس کە ئەفسەرێك بوو لە لەشکری ڕووسدا لە گوندی (ستار اغلاد کوفسکایا)ی چیچانیدا، بەم شێوەیە تاقیکردنەوەی خۆی لە چیرۆکی _سوستبول لە ئایاردا) دەگێڕێتەوەو دەڵێ چیچانیەکان گەلێکی ڕووخۆش و ئازاو جەسوورن، عاشقی ئازادین، لە ساڵی ١٨٣٧دا، دوای شەش ساڵ لە کوشتارو وێرانکاری ڕووسەکان لەشکریان لە چیچان کێشایەوە تاوەکو ماوە بدەن بەفراوان کردنی باکوورو ڕۆژهەڵاتی قەفقاس لەژێرچاودێری ئیمام (شامل)دا. کارل مارکس دەڵێ: بڕوانن ئەم گەلە هەرچەندە توانای کەمە بەڵام

توانی پاڵەوانێتی لە پێناوی ئازادیدا بنوێنێت، بۆیە پێویستە وانەیان لێ وەربگرن. (ترۆناو) کە یەکێك بووە لەو کەسانەی بەشداری کردووە لەهێرش کردنە سەر چیچانیەکان، لەبارەی ئازایەتیانەوە دەڵێ: هیچ هێزێك ناتوانێ لەناویان ببات، ئەوپەڕی ئازان، زیرەکن لەکاروباری سەربازیدا، بەخێرایی هەل دەقۆزنەوە لە هەڵەکانمان سوود وەردەگرن، لە ساڵی ١٨٥٣ دا ئیمام شامل هێزی بەرەو جۆرجیا برد بۆ ئەوەی دەسەلاتی ڕووس دووربخاتەوە. ڕووسەکان ناچاربوون گەمارۆیان بدەن و زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنن، لە ساڵی ١٨٥٦ دا بەتەواوی کەوتنە ژێر دەسەلاتی ڕووس و ڕووسەکان کەوتنە بلاوە پێ کردنیان بە بیانووی ئەوەی کەناوچەکە دواکەوتووەو بۆ پەرەپێدانی ئابووری ناوچەکە هەوڵدەدەن.

لەنێوان ساڵانی ١٨٥٩ و ١٨٦٦دا بەخەستی بەرنامەی کۆچ پێ کردنیان لەلایەن ڕووسەکان خرایە کارەوە. لەسەرەنجامدا بەشێکیان بەرەو دەوڵەتی عوسمانی و بەلقان و ڕۆژهەلاتی ناوەراست کۆچیان کردو بەهەزارانیان لەڕێگادا گیانیان لەدەستدا.

لەساڵی ١٨٧٧دا ڕاپەرینی چەکداری دەستی پێکردەوە، بە سەرۆکایەتی مریدەکانی ئیمام شامل( کەناوی حاج عەلی بەگ) بوو ئەم جارەش ڕووسەکان لەخەڵتانی خوێنیان وەردان بەلام پرۆسەی چۆل کردنی قەفقاس لەپاش ڕێککەوتنی ساڵی ١٨٧٨ کاری پێکرا بەو پێیە هەموو شەرکەسەکان کەنیشتەجێی سنووری هەردوو دەوڵەتن، بەرەو دەوڵەتی عوسمانی کۆچیان پێ بکرێت.

## چیچانەکان لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر

چیچانیەکان بەگەرمیەوە پێشوازیان لەشۆڕشی بەلشەفی کرد، کەچی لە ساڵی ١٩٢٦دا، مۆسکۆ ئەلف و بێی عارەبی قەدەغەکردو

گۆڕی بە ئەلف و بێی لاتینی، لەکۆتاییدا ئەلف و بێی سریلیکییان بەسەردا سەپاندن کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خاسیەتی تایبەتی زمانەکەیان نەدەگونجا. لەنێوان سالآنی ١٩٣٦ – ١٩٣٨دا، ستالین نزیکەی هەشت هەزار چیچانی تەفرو توناکردو بەرەو کازاخستان و سیبیریای دوورخستنەوە. سەرەڕای سێ هەزار چیچانی لەگەڵ هێزی سۆڤیەتیدا دژی نازیەکان دەجەنگان، لەنێوان سالآنی ١٩٥٧–١٩٥٩دا دووسەدو بیست و سێ هەزار چیچانی و ئەنگوشی بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە بەم جۆرە ژمارەیان لە ساڵی ١٩٨٩دا گەیشتە ملیۆنێك.

(جەوهەر دۆدایێڤ) گەیشتە پلەی سکرتێری حیزبی شیوعی ناوچەیی و جەنڕاڵ لە جەیشی ڕووسدا. لە ساڵی ١٩٩١دا سەربەخۆیی چیچانی ڕاگەیاند. (یلتسن) گەمارۆی ئابووری بەسەریاندا سەپاند و لە ساڵی ١٩٩٤دا هێرشی سەربازی کردە سەر چیچانیەکان و پایتەختەکەیانی (گرۆزنی) داگیرکرد، سەرنجامی شەڕەکە بووە هۆی کۆچ کردنی نیوملیۆن و کوژرانی بیست هەزار چیچانی، سەرەڕای پێنج هەزار لە لەشکری ڕووسیدا (سولجنتسین) لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەگەری ووتی: شەڕی چیچان هەڵەیەکی سیاسی گەورەیە قەوارەکەی دەبێتە کارەساتێکی سیاسی، بەتایبەتی لەڕووی پەیوەندییەوە لەگەڵ ناوچەی قەوقازو جیهانی ئیسلامیدا، سولجنتسین حکومەت و پەرلەمان و ڕای گشتی و ڕۆژنامەگەری تاوان بارکرد کەهەوڵی کپ کردنی ئەم هەواڵەیان ئەنجام داوە، لەهەمان کاتدا چیچانیەکانی تاوانبارکرد کەکاری تیرۆرستانە دژ بە ڕووسەکان جێبەجێ دەکەن، بۆ سێ ساڵ دەچێ کە چیچانیەکان لەلایەن خۆیانەوە سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاندووە، سولجنتسین داوای کرد کەواز لەم وڵاتە بهێنن بەتایبەتی زۆربەی زۆری دەنگیان داوە

بەدەرچوون لە یەکێتی ڕوسیادا پێویستە سنورەکانمان لەگەڵ چیچانیەکاندا دیاری بکەین بۆ ئەوەی قاچاغچیەتی لەسەر سنوردا نەکرێ و هەموو ئەو چیچانیانەی لەڕووسیا دەژین، دەبێ داوای جێنشینیان لێ بکرێت یاخود ڕووسیا بەجێ بهێڵن و بەرەو وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە، هەروەها سولجنتسین باوەڕی وایە کەلێیان بگەڕێن سەربەخۆ بن، چونکە خۆیان بۆ ژێر ڕکێفی ڕوسیا دەگەڕێنەوە، جا پرسیارێك خۆی قیت دەکاتەوە لەبەرچی مۆسکۆ توندوتیژی دژی چیچانیەکان بەکارهێنا چونکە چاکی دەزانی کە هەرچەندە چیچانیەکان بەرگری بنوێنن دەتوانێ تەرزاووی کێشەکە بەلای خۆیاندا بشکێنێتەوە، چونکە زۆربەی وڵاتانی جیهان و نەتەوەیەکگرتووەکان بەتەنگ سەربەخۆیی چیچانەکانەوە نین و بەگیروگرفتێکی ناوخۆیی دادەنێن، لەبەر ئەوەیە لە ئاست ئێش و ئازاری چیچانەکاندا بێ دەنگن و بەم جۆرە یلتسن دەتوانێ چیچانەکان بخاتە ژێر یەکێتی فیدراڵی روس و بێ ئەوەی لەڕووی دبلۆماسیەوە هیچ ئاستەنگێکی بێتە ڕێ، بەپێچەوانەوە ئەوروپای ڕۆژئاوا یارمەتی دەدەن بۆ بنیات نانەوەی ئەو شوێنانەی کە لەشکری ڕووس کاول و وێرانیان دەکات.

لەمانگی تەمووزی ئەم ساڵدا دۆکۆزاگاییف سەرۆکی حکومەتی چیچان کەلەلایەن (یلتسن)ەوە پشتگیری لێ دەکرێ، ڕێککەوتننامەیەکی مۆرکردووە، کە ئۆتۆنۆمیەکی سنوردار بە چیچان بدرێ، بڕیاریشە لە ١٧ی دیسبمەردا هەڵبژاردنێك لە چیچان بکرێ، ئەم ڕێککەوتننامەیە لەلایەن ڕاوێژکارەکانی تری چیچانەوە پەسند نەکراوە، بۆیە جەوهەر دۆدایێڤ بەر لەوەی لەلایەن ڕووسەکانەوە تیرۆر بکرێ ڕایگەیاند کە شەڕەکەیان لەگەڵ حکومەتی ڕووسیا تا

ئێستا لەسەرەتادایەو دووپاتیشی کردەوە کەکاری تیرۆرستی هەرگیز لەگەڵ ڕووسەکاندا ئەنجام نادەن، بەڵکو خەباتی پارتیزانی پەیڕەو دەکەن تا سەربەخۆیی خۆیان بەدەست دەهێنن.

جارێکی تر نوێنەرانی روسیا لەگەڵ چیچانەکان کۆدەبنەوە بەمەبەستی ڕاگرتنی شەڕو پێکدادان لەلایەك، لەلایەکی ترەوە خۆش کردنی زەمینەیەکی لەبار بۆ سەرکەوتنی یلتسن لەهەڵبژاردندا کە لەمانگی حوزەیراندا ئەنجام دەدرێ.

رادیۆی BBC یش بلاۆی کردەوە کە حکومەتی ڕووسیا بەرنامەی کاری لەبارەی ڕەوشی ئایندەی کۆماری چیچان پێشکەش کرد کە لەدەقەکەیدا ئاماژە بۆ سەربەخۆیی چیچان نەکراوە، بەلاّم بەپێی پیلانەکە چیچانەکان لەناوچەکەدا دەسەلاّتی دارایی و بەرووبوومە تایبەتیەکانیان پێ دەدرێ، هەروەها پیلانەکە کۆماری چیچان وەکو ولاّتێکی خاوەن فیدراڵ لەچوارچێوەی ڕوسیا وەسف کردووە.

(ڤیکتۆر چێرنۆمێردێن) سەرۆك وەزیرانی ڕوسیا ڕایگەیاند ئەگەرچی جەنگاوەرانی چیچان ڕازی نین لەسەر هەردوو ڕێککەوتننامەی پێشووی تایبەت بە ئاگربڕو ئاڵوگۆڕی دیلەکان کە لەگەڵ مۆسکۆ گەلاّڵەیان کردبوو، مۆربکەن، بەلاّم وەفدی ولاّتەکەی بەردەوام دەبێ دانوستاندن لەگەڵ وەفدی چیچانەکان کە بڕیارە (لەنازەران) پایتەختی کۆماری ئەنگۆش دەست پێ بکاتەوە. هەروەها (چێرنۆمێردێن) گوتی هێزەکانی ڕوسیا ڕێگا بە چیچانیەکان نادەن کەخۆیان لەهەردوو ڕێککەوتنی پێشوو بدزنەوە.

ئاژانسی دەنگوباسی ئینترتاس لەزاری (سیرگی گلنتشکوی) لێپرسراوی ڕوسیاوە ڕایگەیاند کە چیچانەکان تاکو ئێستا سوورن لەسەر ئەوەی مەسەلەی سەربازی و سیاسی پێکەوە باس بکرێن،

لەبەرامبەر ئەوەشدا ڕوسیا مەرجی کشانەوەی هێزەکانی بەداماڵینی چەك لە چیچان گرێ داوە.

## ئەو سەرچاوانەی کە بۆ ئەم باسە سوودم لێ وەرگرتوون ئەمانەن.

1- Patrik Karam, Les guerres du Caucase, Paris, 1995.

٢- ((الشيشان بلاد مكونة بالحلم و الاساطير و المقاومة)) مجلة العربي العدد ٤٣٨، ١٩٩٥.

٣-((حرب الشيشان و الكسندر سولجنتسين)) جريدة الحياة، ١٤ ايار ، ١٩٩٥.

# ولاتی باسك

جۆری خوێن ولێکۆلینەوەی جیناتەکان دەری دەخەن کە باسکەکان گەلێکن لە هەموو گەلانی ئەوروپا جوداوازن،پێش هاتنی هۆزە هیندۆ ئەوروپییەکان، ئەوان لە ناوچەی پیرینیزو چیاکانی کانتابری، ڕەگیان داگوتاوە، وەکو پەندکە دەلێ:- ((پێش ئەوەی گاشە بەرد گاشەبەرد بێ،باسکەکان باسك بوون)).

ولاتی باسك (یان ولاتی زمانی باسك) وەکو باسکەکان بەنەتەوەی خۆیان دەلێن، لەسەر سنوری فرەنسی -ئەسپانی و بە درێژایی پیرینیزی رۆژئاوا بلاوبوونەتەوە، بەدرێژایی چاخەکان ، شەپۆلی رۆمەکان، فیزیگۆتەکان، عەرەبەکان، فرەنسی وئەسپانەکان بە سەر ولاتەکەیاندا تێپەریون، بەلام باسکەکان بەرگەیان گرتووە، بە زۆری خوورەوشتی خۆیان لەناو چیاو لێرەکاندا بەسەربردووە، بۆ ئەوەی بیانپارێزن، هەمان پیرینیزکە ئەسپانیا لەبەشەکەی تری ئەوڕوپا جیا دەکاتەوە باسکەکان یەك دەخات.[1]

باسکەکان بەنەتەوەی خۆیان دەلێن (Euskal Herria) واتە ولاتی زمانی باسك کەلەحەوت هەرێم پێك دێت، سێ هەرێم لەبندەستی فەرەنساداندو چوار هەرێمەکەی تریش لەژێر دەستی ئەسپانیا دان، سالی (١٩٨٠) سێ هەرێمەکەی ئەسپانیا، بزکایا و ئەرابا و جیپوزکا و بەرەسمی یەك خران وەکو جڤاتی ئۆتۆنۆمی باسك، بەلام ولاتی باسك لەسنووره رەسمیەکان تێدەپەرێ و زمانی زگماکی کۆنینەکە یەکیان دەخا، زمانەکە (٥٠٠٠) پێنج هەزار سال پێش

ئێستا لێره قسه‌ی پێ کراوه‌، پێش ئه‌وه‌ی هیندوئه‌وروپیه‌كان بێن وبه سه‌ر كیشوه‌ره‌كه‌دا بلآوببنه‌وه‌، ئه‌مڕۆش زمانه‌كه له‌ناو شاره‌كان وله‌لایه‌ن شوانه‌كانی ناو شاخان قسه‌ی پێ ده‌كرێ، (هه‌رێمه‌كانی لاپوردی وبیهی نافارۆواو زوبیرۆوا)ی سنوری ئه‌سپانیاو ژێر مه‌ودای سیاسی فڕه‌نسا ولآتی باسكی باكوور پێك دێنن، كه‌چی هه‌رێمه‌كانی جیپوزكاواو بیزكایاو ئه‌راباونافارۆدا جارێكی تر دابه‌ش ده‌بن. ئه‌و سێ هه‌رێمه‌ی جڤاتی ئۆتۆنۆمی باسك پێك دێنن وئه‌وه‌ی دوایش خۆی جڤاتێكی ئۆتۆنۆمییه بۆ خۆی))[٢]

((باسكه‌كه‌كانی ڕۆژئاوای چیایی پیرینیزی له‌لای فڕه‌نسا له‌بنه‌چه‌دا له‌هه‌رێمی باسكی ئیسپانیاوه هاتوون- ئه‌م كه‌مه نه‌ته‌وه‌یی‌یانه هیچ كێشه‌یه‌كیان له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی فه‌ڕه‌نسادا نییه‌، چونكه هه‌موو مافێكی‌یان پارێزراوه‌، وه‌كو فه‌ڕه‌نسییه‌كان مامه‌ڵه‌یان له‌ته‌كدا ده‌كرێت وه‌كو ئیتالیاكان و ئه‌ڵمانه‌كان و ئه‌سپانه‌كان كه له‌ده‌وروبه‌ری فه‌ڕه‌نسادا ده‌ژین))[٣]

پێوانه‌كه‌ی نزیكه‌ی (٢٥) هه‌زاركیلۆمه‌تر چوار گۆشه‌یه‌، ژماره‌ی دانیشتوانی پێنج ملیونه سێ ملیۆن له‌ئه‌سپانیا دوو ملیۆنه‌كه‌ی تر له فه‌ڕه‌نسا ده‌ژین، جگه له‌هه‌ندێ ئاواره‌ی باسك كه له مه‌نفاكانی ئه‌ورووپا به‌تایبه‌تی ئه‌مریكاوئوسترالیا ژیان به سه‌ر ده‌به‌ن.

## بیروبۆچـــوونی شاعیرونووســـەرانی فڕەنســـی لـــە بـــارەی باسکەکانەوە.

هەموو ولاتێك لە شوێنی باودا هاوبەشن، گەلی باسك لەگەلیٚ شتی تـردا ئـەوەی بۆماوەتـەوە کـە فۆلتێر باسـی کـردووە دەلـیٚ:-((گـەلێکی بجووکن کە لە سەر پیرینیز بازبازێنیٚو سەمادەکەن )).

دونـی لانگلـوا (DENIS LANGLOIS)پـارێزەر و نووسـەری فڕەنسی، دوای وەرگرتنی خەلاٚتی مافەکانی مرۆڤ،لە بارەی باسکەوە نووسـیویەتی ((لـە سـەر خـوانی ئـەوانم خـواردووە، لەژێربنمیچـیان خەوتووم، لە گـەلٚیان دواوم و دلٚـم پڕهیـوا بووە،جڤاتێکی ڕاستەقینەم بـۆ دەرکـــەوت، لەوانـــە نـــا کەشـــتی فۆلکلـــۆرین ولەســـەر ڕەفـــەی مۆزەخانـەکان دادەنـرێن، بـەلٚکو جڤاتێکی زینـدوو کـە خـاوەنی زمـان وکولتوری دێرینی خۆی هەیە کە بە ئاواتی دوا ڕۆژە، ئەمانە گەلێکن، یەکگرتن ودۆستایەتی وبرایەتی نێوانیان تەنیا هەر قسە نییە، ئەمانە چڤاتێکن ڕیزیان دەکەنە یەك لە بەرامبەر مەترسـی دا، بەلاٚم خەلکەکە گۆرانی دەلێن و سەما دەکەن نەك تەنیا بۆ خۆشی، بەلٚکو لـە ئـەنجامی هەست کردنێکی قوولٚی بەوەی کە لە ژیاندان.

## مێژووی خەباتی باسکەکان

گـەلی باسـك زۆر بـە تونـدی تـیٚ دەکۆشـن لـە پێنـاوی مـافیڕەوای گەلەکـەیان و پاراسـتنی داب ونـەریتی میللـی تایبـەتی خۆیانـدا، بـە درێـژایی مێـژوو لەخـەبات وتێکۆشـانی بـیٚ وچـان دان سـەریان بـۆ داگیرگـەران شـۆرنەکردووە وبـەردەوام بـەرەنگاری شالاٚوهێرشـەکانی داگیرکەران بەتایبەتی فڕەنسیو ئیسپانی بوونەتەوە، ئەم گەلە ئازاو چاو نەترسـە، بـیٚ کۆلٚـدان بـۆ دامەزرانـدنی دەولٚـەتی نەتەوایـەتی لـە

هەوڵو کۆشش دان، بۆ ئەم مەبەستەش گیان دەبەخشن، بۆیە مێژووی ئەم گەلە تێکۆشەرە، مێژوویەکی خوێناوی هەیە کە لە مێژووی گەلی کورد دەچێ، ماوەیەکی دوورودرێژە ئەم هەرێمەی باسك بەتایبەتی ئەو بەشەی لەبن دەستی داگیرکەری ئیسپانیادایە.

((سەرەتای بزوتنەوەی نوێی ڕامیاریی وچەکداری ((باسك)) بۆ ساڵی ١٨٩٥ دەگەڕێتەوە .ئەو سەردەمە لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی باسك دا، بە قۆناخێکی نوێی بوژانەوەی نەتەوەیی دادەنرێ، چونکە ((سابینۆدی ئارانا کویری)) باوکی بزوتنەوەی رزگاریخوازی باسك، بینای فەلسەفەی نەتەوایەتی باسکی کرد وچەمکی نەتەوایەتی باسك وووڵاتی یە کپارچەی باسك و ئارم و نیشانەو ئالای ئۆسکادیی یکگرتووی دانا، ئەمە بووە هۆی بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیریی بە ئاگا هاتنەوەیەکی میللی لەسەرتاسەری ئۆسکادیی داو بەتایبەتی لە باشووری ئۆسکادیی دا کە بە پێکهێنانی (پارتی نەتەوایەتی باسك- P.N.V) خەباتی گەلی باسك بووە ،خەباتێکی ڕامیاری، کۆمەلایەتی، شەهید بوونی و رابەرو پێشەوای بزوتنەوەکە ،لە تەمەنی ٣٧ ساڵاندا بەدەستی ئیسپانیە داگیرکەرەکان ولە یەکێ لە بەندیخانەکانیدا، ئەوەندەی دیکە تاوی بە کڵپەو گڕی ئەو خەباتە رزگاریخوازانە سەند.[٤]

ساڵی ١٩٣١ رژێمی پاشایەتی روخاو رژێمی کۆماری دامەزرا، باسکەکان رۆلێکی گرنگیان گێرا، (بە سەرۆکایەتی خۆسیە ئەنتۆینۆدی ئاگری) بۆ چەسپاندنی ماف چارەنووسی گەلەکەیان، لە (١٥)ی حوزیرانی ساڵی ١٩٣١دا ڕاپرسیێکی ئازادیان لە ناوچەکانی جیپوزکا، بزکایاوئەراباسازکرد.لە ٨٢٪ی دەنگەکانیان بە دەست هێنا.

له ساڵی ١٩٣٦ فەرمانڕەوای کۆماری ئیسپانیا، یاسایی ئۆتۆنۆمی بە هەرێمی، جیپوزکا،بزکایاو ئەرابا بەخشی و سەرۆکی یەکێتی سیاسی نویٚ ی بۆ هەڵبژارد، بەلاٚم ساڵی ١٩٣٧ رژێمی دیکتاتۆر( فرانکۆ) یاسای ئۆتۆنۆمی ڕەت کردەوە وحکومەتی باسك بەرەو مەنفای مەکسیك چوو[٥]

نزیکەی سی و پێنج ساڵە بزوتنەوەی ئیتا(ETA)ی جودا خواز لە شەڕێکی توندو بە هێزدایە لە دژی فەرمانڕەوای ناوەندی ئیسپانیا وبەردەوام گێرمە کێشە بۆ حکومەتی ناوەندی دەنێتەوە، بەسەرۆکایەتی (ئیری باتاسونا) کەچەندین جار لەبەرپەچی هێرشی دڕندانەی داگیرکەری ئیسپانیا ڕێگای تۆقاندن و کوشتنی گرتۆتە بەر بەرامبەر بەمەش حکومەتی مەدرید بەدەیەها لەئەندامە چالاکەکانی لەگرتووخانە ئاخنیوە، ڕێکخراوی (ETA) کورت کراوەی ولاتی باسك و سەربەستی‌یە، ساڵی ١٩٥٦ لەکۆبونەوەیەکی نهێنی‌دا دروست بوو کەئالاٚکەیان (٤+٣=١) کە مانای خستنە پاڵی چوار هەرێمی ئیسپانیا بەسیٚ هەرێمی فەڕەنسا دەگەیەنیٚ تاکو بەسەر یەکەوە دەوڵەتێکی ئازادو یەکگرتوو پێکەوە بنێن. (لەساڵی ١٩٦١)ەوە ئەم ڕێکخراوە پڕۆسیسی سەربازی ئەنجام داوە، بەدانانی تەقەمەنی تەقاندنەوە لەبارەگاکانی لەشکرو پۆلیس دا، یەکەم جڤین یان لەساڵی ١٩٦٢ کرد، بەدیار کردنی شوناسنامەی شۆڕشگێڕیان و لەساڵی ١٩٧٢ دا سەرەك وەزیرانی (بلانکۆ)ی حکومەتی فرانکۆیان تیرۆر کرد لەمەدریدی پایتەخت دا"[٦] لەساڵی ١٩٧٨ دا یاسایەکی نویٚی دەستووری دەرچوو کەمانای ئۆتۆنۆمی بەهەرێم دا، دانیشتوانی لەساڵی ١٩٨٠ دا ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەیی دیاری کرا، بەلاٚم ڕێکخراوی ئیتا و باڵی سیاسی ئەم شێوازەی ڕەت

کردەوەو لەساڵی ١٩٨٣ دا باڵی سیاسی ڕێکخراوەکە وازی لەتوندو تیژیو تۆقاندن هێناو شێوازی ڕێککەوتننامەی لەگەڵ میریدا پەیرەو کرد، هەر لەساڵی ١٩٨٨ لەجەزائیردا باڵی سەربازی لەگەڵدا بوو.(٧)

جگە لەڕێکخراوی (ئیتا)، لەوڵاتی باسکدا پارتی تر هەن کەداوای جیابونەوە دەکەن لەوانە پارتی نیشتمانی باسکی، حیزبی ئیسکوکارنا سوناو ڕێکخراوی ئیتا کێشەیەکی زۆری بۆ حکومەتی ناوەندی ئیسپانیا نایەوە، ساڵی ١٩٧٥ حکومەتی ئیسپانیا هەڵسا بەهەڵواسینی پێنج ئەندامی چالاك، دوو سەرکردەی ئیتاو سێ سەرکردەی بەرەی شۆڕشگێڕی ماوی بەتاوانی کوشتنی پیاوانی پۆلیس تاوانبار کرابوون ئەمەش بووە هۆی بەرز بوونەوە دەنگی ناڕەزایی لەجیهاندا بەبەرژەوەندی ڕێکخراوی باسك شکایەوەو سەرۆکی ئەو کاتەی مەکسیك داوای لەنەتەوە یەکگرتووەکان کرد کەئیسپانیا لەنەتەوە یەکگرتووەکان دەرکرێ، سەرەك وەزیرانی سوید هێرشی کردە سەر (فرانکۆ) بەڵێنی دا کەیارمەتی ئابووری بەشۆڕش بدا، لەئەنجومەنی وەزیرانی دەرەوەی بازاڕی ئەوروپی هاوبەش دا سەرزەنشتی ئیسپانیا کرا بەمەش ئیسپانیا تاڕادەیەك دوورە پەرێز بوو.(٨)

ساڵی ١٩٩٨ هەڵبژاردنێکی سەرتاسەری لەهەرێمی باسکی ئیسپانیدا ئەنجام درا بەڵام هیچ ئەنجامێکی یەك لاکەرەوەی بەدەست نەهێنا چونکە لەلایەك ڕێکخراوی ئیتا بەڕێگای ئاگربەستەکی لەگفتوگۆکاندا لەگەڵ مەرکەزدا نەیتوانی شتێ بەدەست بخا، هەروەها پارتی نیشتمانی باسکیش نەیتوانی زۆرینەی دەنگەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێ، دوای هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٠ (خوسیە ماریا ازنار) سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سیاسەتی خۆی

لەگەڵ حیزبی نیشتمانی باسك دا بگۆڕێ‌و ئاڵۆزی‌و نائارامی لەنێوان حکومەتی مەدریدو حکومەتی هەرێمی باسك سەری هەڵدایەوە، پارتی نیشتمانی باسك سیاسەتی سەربەخۆیی باسکی ڕاگەیاند بەشێوازی دبلۆماسی‌و سیاسی نەك بەشێوازی سەربازی پەرەی بەخەبات‌و تێکۆشان دەدات. ژیانی ئابووری لەهەرێمی باسکدا گۆڕانی باشی بەخۆوە بینی، بەجۆرێ ڕێژەی کرێ لەهەرێمی باسکدا بەرزترە لەهەرێمەکانی تری ئیسپانیا، خۆشگوزەرانی‌و چاك بوونی ڕەوشی ئابووری کارێکی زۆری کردە سەر دانیشتوانی هەرێمی باسك، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە پارتی نیشتمانی باسك هەوڵ دەدا کەڕێکخراوی ئیتا ڕازی بکا کەواز لەتۆقاندن‌و توندو تیژی بهێنێ‌و بچێتە سەر مێزی گفتوگۆ بۆ چارەسەر کردنی کێشەی گەلی باسك وەك لەئێرلەندەی سەروو ڕوویدا. هەرچەندە باڵی سیاسی ڕێکخراوی (ئیتا) ڕەتی هەموو کارێکی توندو تیژی دەکاتەوە کەدەبێتە هۆی پشێوی لەووڵاتداو ئابووری تووشی خراپی دەبێ کەژیانی خەڵکی بەرەو ترسناکی دەبات، حکومەتی ناوەندیش گفتوگۆی بەردەوام لەگەل پارتی نیشتمانی ئەنجام دەدات بەتایبەتی پاش ئەوەی لەهەڵبژاردندا زۆرینەی دەنگی بەدەست هێناوە. حکومەتی ناوەندی دەیەوێ بەزمانی هێمن‌و ئارامی مامەڵە لەگەڵ پارتی نیشتمانی بکات بۆ ئەوەی پەیوەندییەکان بەرەو ئاڵۆزی‌و توندو تیژی نەچێتەوە.

## سەرچاوەکانی ئەم باسە

1- National Geogrphy, Nov, 1995.

٢- لەئینتەرنێت وەرگیراوە.

٣- د. محمد عبد المجید عامر دراسات في الجغرافیا السیاسیة والدولة، دار المعرفة الجامعیة، اسكندریة، ص ٤٤٦.

٤- حوسێن محەمەد عەزیز، خلّتەیزاراویی، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٢٦٢-٢٦٥.

٥- مجلة السیاسة الدولیة، العدد (٤٣) القاهرة، ١٩٧٦، ص١٦٠.

٦- جریدة الاهرام، ایتا الانفصالیة، القاهرة، ٢٠٠١، بروانة مثنى امین قادر: قضایا العقوبات واثرها على العلاقات الدولیة، مركز كوردستان للدراسات الاستراتیجیة، السلیمانیة، ٢٠٠٣، ص٦٠.

٧- جریدة السیاسیة الكویتیة، ١٩٩٧.

٨- مثنى امین قادر: قضایا العقوبات واثرها على العلاقات الدولیة، نفس المصدر السابق، نفس الصفحة.

# سەرۆك میتران قۆناغێكی نوێ بوو لەمێژووی نوێی فەرەنسادا

لە پێنجی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٦دا، یەكێك لەگەورەترین سیاسیەكانی فەرەنساو جیهان مسیۆ میترانماڵئاوایی لە شانۆیی سیاسەت و ژیان كرد، گەلی فەرەنسا هەردەم وێنەی ئەم كەڵە زاناو سیاسەتمدارە لە بیر ناكەن، كەدوای دیگۆل بەگەورەترین سەرۆكی فەرەنسا دادەنرێت، مسیۆ میتران لە ٢٦ی ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩١٦ لەخێزانێكی كاسۆلیكی بورجوازی، لە گوندی كڕناك لەدایك بووە، لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا ڕووی كردۆتە پاریس بۆ ئەوەی لەدوو زانكۆ بخوێنێت یەكێكیان یاساو ئەوی تریان زانستی رامیاری، كاتێ خوێندنی تەواو كرد، خاوەن چوار بڕوانامە بوو، یەكێكیان لە ئەدەب و دووەمیان لە یاساو سێیەمیان لە یاسای گشتیو چوارەمیان لە سیاسیەت بوو، لە ژیانی ڕۆژانەیدا كاری پارێزەرو ڕۆژنامەنووسی كردوون، كە بوونەتە ڕێگاخۆشكەرێك تاوەكو لە سیاسەتدا گۆی هونەری بباتەوە، دیارە لە منالییەوە ئیشی بۆ دەكرد و وەكو ئامانجی سەرەكی بێت لە ژیاندا، لە شەڕی دووەمی جیهانیدا مسیۆ میتران بریندار بوو، لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٤٠دا دەسبەسەر بوو، لە دێسمبەری ١٩٤١دا لە گرتووخانە ڕای كرد، لە ساڵی ١٩٤٢ دا لە حكومەتی فیشیدا كاری مفەوەزی گرتووخانەكانی لە ئەستۆ گرت، لەشەڕی بەرگری ساڵی ١٩٤٣ دا رۆڵی چالاكی گێڕا، ئەندامی یەكەم حكومەتی كاتی بوو، ساڵی ١٩٤٦ بەجێگری حكومەت هەڵبژاردراو لە

ساڵی ١٩٤٧ دا کرا بە وەزیر، نزیکەی پانزە پایەی وەزاری لە کۆماری چوارەمدا تاکو ساڵی ١٩٥٨ بەڕێوەبرد، لە ساڵی ١٩٥٨دا چووە ڕیزی بەرگری کردن و لە ساڵی ١٩٦٥دا خۆی بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژارد، هەرچەندە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا بەڵام توانی ٤٠٪ی دەنگەکان بەدەست بهێنێت و وەکو موونافیسێکی گەورەی دیگۆل خۆی نواند، لەوکاتەوە لە خەبات و تێکۆشان بەردەوام بوو، بۆی دەرکەوت کە دەسەڵات گرتنە دەست و بەڕێوەبردنی وولات، دەبێت حیزبێکی سیاسی لە پاڵ بێت، بۆیە لە ساڵی ١٩٧١دا دەستی بە کۆکردنەوەی چەپەکان و دامەزراندنی پارتی سۆشیالستی فەرەنسی کردو توانی زۆر لەلاوان و چینی مام ناوەندی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، گۆڕانێکی بنەرەتی لە پارتی سۆشیالست کرد، بۆ ئەوەی پێگەی خۆی بەهێز بکات، بۆ ئەم مەبەستە هاریکاری لەگەڵ شیوعیەکان و ڕادیکاڵە چەپەکان کرد.

لە ساڵی ١٩٧٢دا خۆی بۆ سەرۆکایەتی لەدژی ڤالێری جیسکارد دیستان هەڵبژارد، بە ژمارەیەکی کەم شکستی هێنا، بەڵام لە ساڵی ١٩٨١ توانی خەونەکانی بهێنێتەدی و لەشانۆی سیاسیدا دەسەڵات و هێز بگرێتە دەست و فەرمانڕەوایی وولات بکات، لە گەرمەی سەرکەوتنا گوتی: ئەستەنگەکان دەستی پێکرد، دەستی بە گۆڕانکاری ئابووری کرد، بەزیاد کردنی مووچەی فەرمانبەران و کەم کردنەوەی تەمەنی خانەنشینی و زیاد کرد ڕۆژانی پشوودان، ڕێگای بەرەها کردنی موونافەسەی ئابووری ئەوروپیدا، ئەم سیاسەتەی سەری نەگرت بۆیە لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٦ سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام جەماوەری زیاد بوو، توانی بۆ ماوەی دوو ساڵ لەگەڵ حیزبی ڕاستی شیراکدا کار بکات، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ دا جارێکی تر

لەهەڵبژاردندا بەسەر شیراکدا زاڵ بوو، بەمەش سەرۆکایەتی بۆ ماوەی حەوت ساڵی تر مسۆگەر کرد. لە ١٩٩١/٢/٧دا فەرەنسۆ میتران چووە پاڵ ئەمەریکاو بەریتانیا بۆ ئازاد کردنی کوێت، مسیۆمیتران لە تەلەفزیۆندا رایگەیاندو گووتی: ناخۆشیەکی کوشندە جیهان دەگرێتەوە، پاشان گوتی:- هێرش کردن شتێکە ڕوودەدات و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی چ لەلایەن لەشکری عێراق یاخود هاوپەیمانەکان بەکاری بهێنێت، دژی دەوەستین، چونکە ئەگەر ئێمە ئەمە بکەین ئەوا بەرەو چەرخی وەحشیەتگەری دەگەڕێینەوە، ئێمە لەگەڵ سەدو پەنجا دەوڵەتدا مۆرمان کردووە، کەنابێت ئەم جۆرە چەکە بەکار بێت، پاشان جەختی لەسەر ئەوە کرد کە ئەم شەڕە بەهیچ شێوەیەك نابێتە شەڕێکی گەورەی جیهانی، بەڵکو بە ڕزگار کردنی کوێت کۆتایی دێت، جارێکی تر لە ساڵی ١٩٩٥ پارتی سۆشیالیست نوشوستی هێناو جاك شیراك حکومەتی گرتە دەست بەم جۆرە لەماوەی چواردە ساڵی فەرمانڕەواییدا توانی زۆربەی زۆری سەرۆکەکانی جیهانی ببینێت و هەوڵی زۆریدا بۆ یەکێتی ئەوروپی بەتایبەتی یەکگرتنی فەرەنساو ئەڵمانیا، پشتگیری گەلانی جیهانی سێیەمی کرد، بەتایبەتی خەباتی گەلی فەلەستین‌و خەباتی گەلی کوردو ئەرمەن‌و بەربەرەکان، نزیك کردنەوەی باکوورو باشوور و جێکردنی دیالۆگ لەنێوانیاندا.

لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، کەسایەتی ناسراوی فەرەنسا فەرەنسۆ میتران ناوی لەمێژووی نوێدا تۆمار دەکرێت لەکاتی کۆچ کردنیدا (هلمۆت کوڵ) ڕاوێژکاری ئەڵمانیا گوتی: بە وون بوونی میتران ئەوروپا خەسارەتێکی گەورەی لێکەوت، پیاوی دەوڵەت بوو، ڕۆڵێکی مەزنی لە دروست کردنی یەکێتی ئەوروپی بینی بەتایبەتی قووڵ

کردنەوەی پەیوەندی نێوان فەرەنسا و ئەڵمانیا، لە برۆکسل سەرۆکی لیژنەی ئەوروپی (جاك سانتێر) گوتی میتران یەکێك بوو لەوانەی بەگەرمی بەرگری لەمەسەلەی یەکێتی ئەوروپی دەکرد، (جۆن مێجەر) ووتی: میتران بەشداری‌یەکی بێ پایانی ژیانی گشتی کرد بەتایبەتی لە فەرەنسادا زۆر ئازایانە بەرنگاری نەخۆشیەکی کوشندە بۆوە کە نەخۆشی شیرپەنجەیە.

(جۆرج بۆش) گوتی: میتران لە جەنگی کەنداودا هەڵوێستی دۆستانەی هەبوو، پەیوەندی نێوان عێراق و فەرەنسای خستە لایەکەوە و ووتی : نابێت بەزۆرداری دەست بەسەر دەوڵەتێ بگیرێت کە لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا ئەندام بێت.

# سەرۆك وەزیرانی سوێد ئۆلف پالْمە ١٩٢٧ – ١٩٨٦ بە قوربانی دیموکراسییەت بوو

شەوی (٢٨)ی شوباتی ١٩٨٦ ئۆلف پالْمە لە سینەمادا لەگەڵ ژنەکەیا بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە بەبێ پاسەوانو بە پیاسە دەڕۆیشتن لەدووری چەند سەد مەترێك كەسێكی چەپەڵ چاوەنواڕی دەكرد، کە ئۆلف پالْمە نزیك بۆوە، گوللەبارانی کردو لەچاوان بزربوو، لەدوای خۆیدا لاشەی گەورەترین سەرکردەی مێژوویی سوێدی بەجێهێشت، کەناوبانگی لەسەرجەم جیهاندا ناسرابوو، شەهید کردنی ئۆلف پالْمە هەموو جیهانی هەژاند، کۆمەڵێك پرسیاری لەدوای خۆیدا وروووژاند، کێ ئۆلف پالْمەی کوشت؟ هۆی کوشتنەکەی چی بوو؟ بۆچی کوژرا؟ چ لایەنێك ئەم کارە دڕندەییەی ئەنجامدا؟ ئایا سوێد دوژمنی هەیە؟ لەبەرچی ئەمە ڕوویدا؟ ئەم پرسیارانەو چەندان پرسیاری دی تاکو ئیمڕۆ بێ وەڵام ماوەنەتەوە.

کاتێ هەواڵی کوشتنی ئۆلف پالْمە بلاْوبۆوە ڕۆژنامەی (Dagsnyheter)ی سوێدی نووسیبووی چۆن ئەمە لە وولاْتی ئێمەدا ڕوودەدات، لەوانەیە شتی وا لە ئەمەریکا یاخود لە ئیتاڵیا ڕووبدات، بەلاْم ناتوانرێ بەڕاست بزانرێت کە لەوولاْتی سوێد ئەمە ڕوویداوە، بەش بەحاڵی خۆم ئەو شەوەی ئۆلف پالْمە دڵە مەزنەکەی لەلێدان کەوت شەو تا بەیانی خەو نەچووە چاوەکانم، چونکە باوەڕم نەدەکرد کە نەك لە سوێد بەڵکو لەهەموو دنیادا کەسێك هەبێت دەستی بچێتە خوێنی ئۆلف پالْمە، کەبەواتای ووشە مرۆڤێك بوو بۆ خزمەتکردنی

مرۆڤایەتی دروست ببوو، دڵی لەگەڵ هەژارو چەوساوەکانی جیهاندا بوو، دژی ستەم و زۆرداری بوو، لەگەڵ ماف لێقەوماواندا بوو، بەدڵ و بەگیان لە پێناویاندا خەبات و تێکۆشانی دەکرد بێ سڵەمینەوە ئەم کارانەی زۆر ئازایانە جێبەجێ دەکرد هاوڕێی ڕێگای ڕاستی هەموو دۆزێکی دادپەروەرانەی جیهانی سێیەم بوو، لەدژی گەمارۆی ئەمریکی، (بەرگری لە ڤیدل کاسترۆی) کرد بەدرێژایی شەڕی ڤێتنام خەباتی دژی ئەمەریکا دەکرد، دژی ڕەگەزپەرستی لەخوارووی ئەفەریقا بەتوندی وەستا، زۆر هەوڵیدا بۆ ئازادکردنی (نیکسۆن ماندێلا) پشتگیری کێشەی فەلەستینی دەکرد، لەگەڵ رژێمی چەپی (نیکاراگوا) بوو دژی ئەمەریکییەکان ، سەرکردەیەکی بێ هاوتای زمانی دایەلۆگ بوو، لەنێوان باکوور و باشووردا، هەوڵی زۆریدا کەناکۆکییەکانی نێوان باشوورو باشوور چارەسەر بکات، لەوانە کێشەی نێوان عیراق و ئێران، زۆر جار سەردانی ئێرانی کرد بۆ ڕاگرتنی جەنگی نێوان عیراق و ئێران، لە دیمانەیەکدا کوردەکانی سوێد لێیان پرسی بۆچی پشتگیری گەلی کورد نەکات، لەوەڵامدا وتبووی کوردەکان داوای ئۆتۆنۆمی دەکەن، ئۆتۆنۆمیش مەسەلەیەکی ناوەوەی وڵاتە، ئێوە داوای شتی گەورە تر بکەن، چۆن من پشتگیریتان ناکەم، هەردەم لەگەڵ کێشەکەتاندام و دریغی ناکەم. کوشتنی ئۆلف پالمە هەموو لایەکی خستە کار بۆ دۆزینەوەی سەرە دەزوویەکی گرێیەکە، پۆلیس و ئاسایش بەدرێژایی ساڵانی ١٩٨٦-١٩٨٧ لیژنەیەکیان لە چەندان کەسایەتی و نوێنەری دەوڵەت لەقازی و لێکۆڵەرەوە پێکهێنا بۆ ئەم مەبەستەش بەسەدان لێکۆڵینەوە و بە هەزاران گریمانەیان خستەڕوو، نوێترین شێوازی زانستیان بەکار برد، بە یارمەتی و هاریکاری تۆڕی سیخوری جیهانی، بەڵام سەر

ئەنجامەکەی بەداخراوەیی مایەوە، سویدییەکان کوشتنی ئۆلف پالمە لەگەڵ (جون کەنەدی) بەراورد دەکەن.

ئۆلف پالمە سەرکردەیەکی خۆشەویست بوو، رووناکبیرێکی پڕ مەعریفەت بوو، سیاسەتمەدارو ئابووری زانێکی پڕ ئەزموون بوو، جگە لە زمانی سویدی زۆربەی زۆری زمانە جیهانیەکانی وەکو (ئینگلیزی، فەڕەنسی، ئەڵمانی، ئەسپانی و نەرویجی) دەزانی.

لەکاتی فەرمانڕەوایی کردنیدا لەنێوان (١٩٦٩-١٩٧٦) پاشان لەنێوان (١٩٨٢-١٩٨٦)دا، زۆر بایەخی بەکاروباری ناوخۆی سوێد نەدەدا، زیاتر خەریکی کاروباری جیهانی بوو، لەسیاسەتی دەرەوەدا دژایەتی سۆڤیەتی جارانی نەدەکرد، دژی بوونی سەربازی ئەمەریکی بوو لە ئەوروپادا، هەروەها ڕەخنەی لە مسیۆ میتران گرت کە رێگەیدا مووشەکی (بیرشینگ) لە ئەوروپادا بلاوبێتەوە، لەسیاسەتدا زۆر واقیعییانە هەنگاوی هەڵدەنا، لەهەوادارانی سەرمایەداری ئارامو پرۆژەی سەربەست بوو، کوشتنی ئۆلف پالمە بیروباوەڕی جیاوازی چێکرد، هەندێ پێیان وابوو، هۆی کوشتنەکەی سیاسییە نەك تاکە کەسی، چونکە قوربانییەکە سەرۆکی حکومەتەو کەسێکە پایەکی دیاریکراوی هەبوو لەدەسەڵاتدا، هەندێکی تر باوەڕیان وابوو ئەوەی لە پشت ئەم کوشتنەیە لەوانەیە بیانی بێت، دوژمنی دەرەوەی زیاترە وەك ئەوەی لەناوەوە بەرهەڵستکاری هەبێ، کاتی خۆی پەنجەیان بۆ (p.k.k) درێژکرد بەڵام پۆلیس دەیویست بەهۆی کوردەوە ڕاستیەکان بشارێتەوە، لەدواییدا پاشگەزیان لێ کردو پەشیمان بوونەوە، پاشان گومان خرایە سەر کۆمپانیای بازرگانی چەکی ئەوروپی چونکە کارگەی (فوش) کەچەکی بەملیارەها دۆلار بەهیندستان دەفرۆشت لەلایەن ئۆلف پالمەوە قەدەغە کرا، هەروەها ئاماژە بەهەندێ

کۆمپانیـای بازرگـانی (کـانزایی) نێـوان باشـووری ئـەفریقیاو ئـەوروپا دەکرا. چونکە ئۆلف پاڵمـە وولاّتـە ئەوروپیـەکانی ئاگادار کردبـۆوە کـە پەیوەنـدی خۆیـان لەگـەڵ ڕژێمـی ڕەگـەز پەرسـتی خـواروی ئـەفریقیا ببڕن و گەمارۆی ئابووری بخەنە سەریان.

(CIA)ی ئـەمریکی لـە لیسـتی گومـان لێکراوەکانـدا بەتایبـەتی لەسەردەمی (ڕۆنالد ریگـان)دا کـە سیاسـەتێکی هێرشـکەرانەی هـەبوو، ئۆلـف پاڵمـەش وەك سـەرکردەیەك هـەردەم دژی سیاسـەتی دەرەوەی ئەمـەریکابوو، دەیویسـت خـۆی لـە سـوید خانەنشین بکـات و خـۆی بـۆ سکرتێری (UN) هەڵبژێرێ ئەمەش بە یـەکێك لەهۆیـەکان دەژمێـردرێ کە ئەمەریکا دەیویست لەدەستی ڕزگاری ببێ، لـەناوەوەی سـویدیش هەنـدێ پۆلیسـی نهێنی کـە مـەیلی ڕاسـتڕەوییان هـەبوو زۆر ڕقیـان لـە ڕەنگـی چەپی ئۆلـف پاڵمـە دەبۆوە، هـەروەها هەنـدێ ڕەگـەز پەرسـت و (تریاك کێش)و تاوانکار بەتایبەتی (کریزپیێترسۆن) کە بەڵگەنامەیـەکی باشیان لەسـەر دروسـت کـرد خێزانـی ئۆلـف پاڵمە پەنجەی تـاوانی بـۆ درێژکردووە لە سەرەتادا دادگا بڕیـاری گـرتنی دەرکـرد، بـەلاّم دادگـای بـالاّ بڕیارەکـەی هەڵوەشـاندەوە بـە بیـانوی ئـەوەی کـە تاوانبـار دانـی بەتاوانەکـەی نـەناوە، هـەروەها چـەکەکەش دیـار نی‌یـە، بۆیـە دەبـێ (کریزپیێترسۆن) ئازاد بکرێ و قەرەبووی ئەو ڕۆژانەی بەندیخانەشی بۆ حساب بکرێ، هەندێ پۆلیسـی سـوێد هـەرپاش کوشـتنی ئۆلـف پاڵمـە وولاّتیان بەجێ هێشـت و ڕوویان کـردە ئەمـەریکا، بەتایبـەتی سـەرۆکی پۆلیس خۆی خانەنشین کـرد، لـەکاتی کوشـتنی ئۆلـف پاڵمـە، کۆمـەڵێ سیخوری باشووری ئەفریقیا لەسوێد بوون بەتایبەتی (تۆنی وایت) کـە ڕووخسارێکی بکوژی هەیەو بکوژێکی ڕۆدیسی ڕەگەز پەرسـتە ئێسـتا لـە قـوبرس دەژی، خزمـەتی تـۆڕی سـیخوری تورکیـا دەکـات لـەدژی

کوردەکان، زۆر لە سویدییەکان سەفەریان بۆ باشووری ئەفریقیا کرد بۆ ئەوەی زانیارییان چەنگ بکەویٚ لەوانە وەزیری دادی سوێدی هەروەها لیژنەی لێکۆڵینەوەی ئۆلف پاڵمەو بەشێك لە رۆژنامەنووسان بەهۆی نەمانی رەگەز پەرستی لە باشووری ئەفریقیا ساغ کردنەوەی ئەم کێشەیە شتێکی ئاسان نی‌یە، بۆیە ئەمەش وەکو بەڵگەکانی تر بیٚ وەلاّمو بەداخراوەیی دەمێنێتەوە هیچ ئەنجامێك بەدەستەوە نادات یەکیٚ لەگەورە لێپرسراوی سیخوری ئەفریقیا (یوجین دوکوك) کەتاوانبارە بەوەی شەش تاوانی ئەنجام داوە، هەروەها دانی بەوەش ناوە کە ئۆلف پاڵمەشی کوشتووە، هەروەها وتویەتی کە دەزگای سیخوڕی پیلانی کوشتنی ئۆلف پاڵمەی جێبەجیٚ کردووە لە تۆڵەی ئەمەی کە ئۆلف پاڵمە وای لە وولاّتانی ئەورووپا کردووە کە ڕژێمی (بریتۆریا) دوورە پەرێز بکەن ئەوەندە هەیە (دوکوك) ناسنامەی کەسەکانی ئاشکرا نەکردووە، دەڵیٚ لە ژیان ماوون و هەندێکیان لە دورگەی نێوان یۆنانو قوبرس دەژینو پەیوەندی‌یان بە تۆری سیخوڕی تورکیاوە هەیە، هەروەها ئاماژەیەکی بەهێز هەیە کە ئەو کەسەی تاوانەکەی ئەنجامداوە سوێدی بووە بەلاّم بەڕەچەڵەك تورکە.

باشوری کوردستان

## بەربەرەکان گەلی رەسەنی ئەفریقان

**کێشەی بیابانی رۆژئاوا**

YOUGOSLAVIE
Serbie
Kosovo
BULGARIE
Skopje
Tetovo
Gostivar
irana
Debar
MACÉDOINE
Ohrid
Bitola
ALBANIE
GRÈCE
Forte population albanaise

مەکەدۆنیا

**چیچان**

# پێرست

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٥ی

## بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێر | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٠١ | بەئاشتی کردنی پەروەردە | عەبدولعەزیز عومەر | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٣٠٢ | پیاسەیەك بەکوچەکانی قەدەردا | ئاویزان نوری | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٣ | گۆڤاری تێکست ژمارە (٥) | چاپ‌وبڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٣٠٤ | دەنگی بلورینی دەق | عەبدولخالق یەعقوبی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٠٥ | ڕۆناك | جگەرخوێن | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٦ | بۆ زمان | د.عیزەدین مستەفا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٠٧ | دوورگەی بێداری | تەها ئەحمەد ڕەسوڵ | شانۆگەریی | چاپکردن |
| ٣٠٨ | داستانی خەبات‌و ماڵئاوایی | شێخ حسێنە سوورە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٠٩ | ماچی گوڵشەن‌و کانیاوەکانی کوردی | ئەحمەد هیرانی | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣١٠ | شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ | عەبدولقادر ساڵح | ڕامیاری | چاپکردن |
| ٣١١ | کورد لەچەند تۆمارێکی مێژووییدا | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣١٢ | فەرهەنگی کورد ناسین | مەلا عەبدولخالق شوانی | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٣١٣ | شیخ محمد خال مفسرا | عمر علي محمد | ماجستێرنامە | چاپکردن |
| ٣١٤ | دیوانی مەزلوم | ئا/ ئومێد کاکە ڕەش | دیوانی شیعر | چاپکردن |
| ٣١٥ | دیوانی فۆلکلۆری ناوچەی ئەردەڵان | ئا/ح. موحسن | فۆلکلۆر | چاپکردن |
| ٣١٦ | ئەنفال‌و ڕەهەندە سۆسیۆلۆجیەکان | محەمەد ڕەئوف ساڵح | ڕامیاری | چاپکردن |

# Nationalist questions and political events of Kurdistan and the world

By: Kamal Maarof

2004 -Suleymaniya